ئیسسی پژمان



# نهێنییەکانی بەستنی [illegible]یمانی ١٩٧٥ - ی ئەلجەزائیر

## لە ئارشیفی تەواو نهێنیی ساواک

وەرگێڕانی : ناسر ئیبراهیمی

سەرگێند ١٩٩٢

# نهێنییەکانی پەیمانی شومی ئەلجەزائیر / ١٩٧٥

من بە ڕێنوێنی و سەرپەرشتی سەرۆکی ڕاستەوخۆم سەرهەنگ دوکتور پاشائی بێ وچان دەستم کرد بە خوێندنەوەی پەروەندە و کتێب و بەڵگەی رابردووی کورد و کوردستان (کوردستان و کوردەکانی تورکیە، عێراق، سوریە و روسیەی جیا کراوە لە ئێران). بەم هۆیە بەشێك بە ناوی "کوردەکان" لە ئیدارەی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست پێکهات کە من بە سەری ڕا بکەم. هەرچەند دواتر ئاگاداری ئەوە بووم کە فەلسەفە و هۆی دانانی من لە ئیدارەی دووهەمی زانیاری دەرەوە (ئیدارەی پشکنین)، بۆ سەرکۆنسولگەری ئێران لە سلێمانیەی عێراق بە ناونیشانێکی تر، بۆ کۆکردنەوەی ئاگاداری لە ناوچەی حەساس و گرنگی کوردستانی عێراق بوو.

سەبارەت بە ئۆگری زۆر و شارەزاییم بە کار و ئیشی تایبەتیم و هەل و مەرجی ئەو کات، بوومە جێگای سەرنجی سەرۆکەکانی خۆم ئەیانناردم بۆ دەرەوەی وڵات و شوێنی دیاری کراو. بە ڕاستی باسی پیاوەتی و لە کارزانی هەریەك لە بەرپرسەکانی ساواکی ئەو دەم وئەوەندە زۆر بوو کە بۆ هەر یەك لەوانە دەکرێ باسایکی درێژ لە وتارێکی جیاوازدا بنوسرێ. کە لە کاتی خۆیدا خوێنەر لەوانە ئاگادار ئەکەم.

یەك لەمانە پیاوەتی سەرهەنگ دوکتۆر پاشائییە، کە ئەو کات عەقڵم بڕی نەدەکرد و هۆش و هەستم توانای ئەو تێگەیشتنەی نەدەدا. ئەوە بوو کە چونکە خۆی ئەوەندە لێهاتوو ناسراوی گشتی و بە تایبەت بەرپرسەکانی بەرزی ساواك بوو، پێویستی بە بچوکترین خۆ دەرخستن و فیزی پڕ و پوچی نیزامیگەری نەبوو. هەوڵی ئەو دایم ئەوە بوو کە بەردەستەکانی خۆی بە سەرۆکەکانی سەروتر بناسێنێ بەم شێوەیە ئەوانی بۆ کاری باشتر و زۆرتر هان دەدا.

بۆ وێنە ئەو پەروەندانەی کە پێویستیان بە شی کردنەوەی زارەکی هەبوو لەلای کاربەدەستانی سەروتری ساواك بانگیان دەرکرد نەدەچوو لە جیاتی خۆی، کارمەندانی روتبەی خوارەوەی دەنارد، لەوانە من کە دەرەجەی بچوکتر و پلەی نزمتر هەبوو، بۆ سەرۆك و کاربەدەستنی سەروش نەناسراو بوو هەرچەندە پێم دادەگرت کە ئەو بانگکراوە دەبێت بچێ و روونی بکاتەوە، بەلاّم ئێمەی دەنارد و بەم جۆرە کەم کەم کاربەدەستانی سەروو دەیاناسیم. ئەمانە نیشانەی ئینسانیەت و خەصلەتی گەورەی ئەفسەرێکە. دەنا لە ناو ژیانی نیزامیدا مل بە ملەو ئێرەیی (دەڵێن پێشبڕکێ یان مل بە ملەو شێوەیەکی ئێرەیی‌یە لە شکلّ و شێوە و هەل و مەرجی تایبەتی‌دا)، دەبێتە هۆی تێکچونی کار و ناخۆشی و دوژمنایەتیەك کە لە گوتن نایەت.

ئەم دوژمنایەتی و ڕکەبەرییە یان ئەم ئێرەیی‌یە هەموو کات زەرەر و زیانێکی رادە بەدەری بەو کەس و رێکخراوانە گەیاندوە.

ئەو نە تەنیا لەگەلّ کەس دوژمنایەتی نەبوو، بەلّکو لە پێشبڕکێش خۆی دەپاراست ئەم ئەفسەرە بەو هەموو کەرامەت و لێهاتوویيەوە کە لەسەرەوە باس کرا لەسەر هەلّەیەکی بچوك هەلّبەت لە روانگەی پاشای ئێرانەوە لە کاتێکدا کە ئەرکی خۆی بە رێوە بردوو لە ساواك لەسەر ئیش دەرکرا و شا فەرمانی دا کە ولاّتەکەی بە جێ بهێلێت. ئەو کەسەی کە عاشقی ئێران بوو، وە بێجگە لە خزمەت و گەورەیی و پاشی ئێران و جگە لە تێر و تەسەلی و ئاسوودەیی بۆ میللەت و گەلەکەی ئاواتی دیکەی لەسەردا نەبوو، ئێرانی بە جێ هێشت و لەگەلّ بنەمالّەکەی بەرەوە ولاّتی غەریبایەتی بارگا و بنەی تێکنا.

ولاّت و میللەتی لە خزمەت بێ بەش کرد و ئێمەشی لە پەژارە و ماتەمین دانا. ئێستاش ئەو هەر لە دەرەوەی وولاّت ئەژی و کاتێك کە ناوی ئێران دێت ئەسرینێ بە سمێلە قەیتانیەکەیدا دێتە خوار و جەرگان دەسوتێنێ. ئەوە بوو نەتیجەی خزمەت و ئەمەکداری و داوێن پاکی و ئەرك ناسی ئەم وەلانانەی لە

کاتێکدا بوو کە وەك ئەتاشەی ئیزامی، لە لوبنان سەرۆکایەتی نوێنەری ساواکی لە ئەستۆ بوو، ڕووداوی ١٥ای خوردادی ٤١ یش هەر لەم ساڵەی وەلانانی ئەودا ڕوویدا بوو.
بگەڕێینەوە سەر باسەکەی پێش وەلانان وە دوور خستنەوەی دکتۆر پاکرەوان. ڕۆژێك سەرهەنگ پاکرەوان منی بانگ کرد و گوتی تۆ بە نوێنەری ساواك لە عێراق وەك یاریدەدەری کارداری ئیزامی لە باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدا هەڵبژێردراوی. ڕاست ساڵێك دوای شۆڕشی ١٩٥٨ ی عێراق وەکو شۆڕشێك کە هەولین خەبەری دەست پێ کردنی ئەم شۆڕشەم لە ماموریەتێکی ناوچەی کوردستان و لە شاری سەقز بۆ تاران نارد، لە ئیدارە هەموو گاڵتەیان پێ کردم و هەروەها شای ئێرانیش تووشی توڕەیی و سەرسوڕمان هاتبوو. لە کاتێکدا دوای مانگێك شۆڕی ١٩٥٨ ڕووی دا و هەموو ئاگادار بوون و گاڵتە و توڕەیی و سەرسوڕمان بوو بە پێدا هەڵگوتن و دەست خۆشانە بەسەرهاتی شۆڕش بەڕێوەبەرانی سەرەکی، دەست تێوەردانی بێگانە و دواتر مل بە ملەی توندی ڕێبەرانی کودیتا بوو بە هۆی دوژمنایەتی وە ڕکەبەری توند و زیندانی کردنی سەرتیپ عبد السلام عارف یەکێ لە سەرۆکەکانی شۆڕش لە لایەن سەرۆك وەزیرانی شۆڕش سەرتیپ (ژەنەراڵ عبدالکریم قاسم)ەوە. بە کورتی دوای کۆدێتای ناوبراو، قەومیەکانی لایەنگری ناسرو بەعسیەکان بە ڕێبەرایەتی عبد السلام عارف کە ماوەی ساڵێك بوو لە بەندیخانە هاتبووە دەرەوە و هەروەها سەرتیپ احمد حسن بکر و صدام حسێن التکریتی لە ساڵی ١٩٦٣ کودیتایەك کە بە قسەی خۆیان شۆڕشیان کرد کە عبدالکریم قاسم ئیعدام کراو سەرتیپ عبدالسلام عارف بە دەرەجەی ئەرتەشبد (مشیری بە قەولی ئەرتەشی عێراق) بوو بە سەرۆك کۆمار و احمد حسن البکر بە سەرۆك وەزیر. دوای ماوەیەك کێشەی نێوان قەومیەکان و بەعسیەکان سەری هەڵدا. عبد السلام عارف سەرتیپ احمد حسن البکری لە سەرۆك وەزیر لابرد و دکتۆر عبد الرحمن بزاز

که له مامۆستایانی بەناوبانگی زانستگای بەغدا و لە زانایان و سیاسەتی دارانی ناسیونالیستی عیراقی و دۆستی هویدا سەرۆك وەزیری پێشوی ئێران بوو، کردی بە سەرۆك وەزیر.

بێجگە لە رووداوێك کە لە کاتی ئەرتەشید عبد السلام عارف دا روویدا هاوکات لەگەڵ ماموریەتی من بوو لە عێراق عبد الرحمن عارفی برای کە فەرماندەی لەشکری پێنجی بعقوبە بوو لە جێگای عبد السلام دانیشت و عبد الرحمن بزازیش وەك سەرۆك وەزیر مایەوە. حیزبی بەعس کە لە کاتی عبد السلام عارف دا نهێنی ببوو، هەوڵی دەدا بۆ روخانی دەوڵەت، لە ساڵی ١٩٦٨ بە کودەتایەك بە ڕێبەرایەتی سەرلەشکر حسن البکر حکومەتی گرتە دەست و عبد الرحمن عارف ی دوور خستەوە بۆ تورکیا، ئەم حیزبە کە هاوڕەگەزەکەی لە سوریا بە ڕێبەرایەتی حافز ئەسەدە، لەسەر حوکمە ئێستاش لە عێراق هەر خەریکی فەرمانڕەوایی و بەرەخوازییە.

تێکۆشانی ساواك کە لەسەر ویست و نیەتی شای ئێران بۆ گێڕانەوەی ڕژێمی پاشایەتیلە عێراق دەست پێ کرابوو، هەر لەو کاتەشدا بۆ هانە سەر کاری حیزبی بەعسیش کاریگەر بوو. ئەم دۆستانە، ئەم خۆشەویستانە !! کە سەدان هەزار برا و رۆڵە و جگەر گۆشەی ئێرانی ئێمەیان لە ماوەی هەشت ساڵ شەڕی داسەپاوی ماڵ سوتێنەردا، نابوت کرد، هەر ئەوان کە بۆ وەدەست خستنی دەسەڵات لە یارمەتی ئێران کەڵکیان وەرگرت ئەمانە مەسەلە و مەبەستگە لێکن کە تا ئیمڕۆ لە ریزی کار و کردەوەی نهێنی وڵات دا بوون کە کەس نەیتوانیوە بیاننوسێ و تەنانەت لەو مەسەلانە ئاگاداریش نەبووە. ئەمانە و گەلێك مەسەلەی دیکەی سەرنج راکێش کە بە تەواوی نهێنی لە ماوەی پێنج ساڵ تێکۆشانی ساواك و ماموریەت و مانەوەم لە بەغدا کە دەستم لە زۆربەی رووداوەکاندا هەبووە، بە درێژی لە وتاری جیاوازدا بۆ تۆمار کردن لە مێژووی هاوچەرخی ئێراندا بە ئاگاداری خوێنەران و هاونیشتمانانی دەگەیەنم.

لەبەر ئەوەی خوێنەر تووشی ماندوبون و سەر ئێشە نەکەم دەمەوێ بچمە سەر ئەصلی باسەکە کە مەبەست و ناونیشانی ئەم نوسینەیە، بەلاّم دەبێ بە کورتی سەرەتایەك لە دەستپێکیی چوونم بۆ عێراق و دەستپێکردنی کارەکەم لە بەغدا بنوسم تا بگەمە سەر چیرۆك و دەست پێکردنی کارەکانم و پێکهێنانی توانا و نفوزی نهێنی لە عێراق کە بووبە هۆی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ ی ئەلجەزایر لە کاتی سەرۆك کۆماری هواری بومیدیاندا دا.

لە سەرەتادا لەگەڵ ئامادە بوونی کەل و پەل و لێکۆڵینەوەی پێویست لەسەر رووداوەکانی عێراق، بە تایبەت مەسەلەکانی رۆژی عێراق، چونکە ساڵێك بوو موتالاّم لەسەر کردبوو، سەبارەت بە بونی دوو ملیۆن کوردی جیاکراوە لە ئێران و نیشتەجێ لە باکوری عێراق کە لە مەسەلەکانی گرنگ و رۆژی ئەم ولاّتە بوو، زانیاری و دەسەلاّتی تەواوم وە دەست هێنابوو. بە هەست و سۆزێکی لە ڕادە بەدەر و دڵێکی پڕ لە هیوا بۆ خزمەت بە نیشتمانەکەم بەرەو عێراق کەوتمە رێ لە ناوچەی مەنسور لە دەرەوەی بەغدا، لە ماڵی برادەر عبد الهادی چەلەبی، یاریدەدەری پێشووی سەنای عێراق کە دوای شۆڕشەکەی ٥٨ هەلاّت و لە لوبنان خۆی گرتبۆوە نیشتەجێ بووم، ماڵێکی گەورە و پڕ لە کەل و پەلی ژیان بوو، لەبەر ئەوەی خاوەنی ماڵەکە ڕای کردبوو، وەکیلەکەی بە قیمەتێکی هەرزان بۆ ماوەی چوار ساڵ خانووەکەی بە کرێ دا بە من، لێرەدا خراپ نییە کە ناوی عبدالهادی چەلەبی هاتووە، بۆ گۆڕانی چێژەکە بە کورتی باسێکی چۆنیەتی ئاشنایەتیم لەگەڵ ناوبراو بکەم لە کاتێك لە تاران بووم.

لە سەرەتای پێکهاتنی ساواك لە ئیدارەی ئیتلاّعاتی دەرەوە گەلاّلەیەك بە دەستەوە بوو بۆ پێکهێنانی نفوز و دۆزینەوەی دۆستانێك بۆ ئێران لە ولاّتانی دراوسێ و پاشان لە ولاّتەکانی دیکەش بە گوێرەی پێویست و گرنگی لە کەسایەتیە بەناوبانگەکانی دەوڵەتی و یا غەیرە دەوڵەتی داوەت بکرێ کە لە کاتی سەفەر بۆ ئێران و ئاشنایەتی لەگەڵ بارودۆخی رۆژی ئێران کە لەگەڵ

کاربەدەستانی یەکەمی دەوڵەت و لە کاتی پێویست لەگەڵ شای ئێرانیش چاوپێکەوتن و وتووێژیان هەبێ. لەسەر ئەم بناغەیە عبد الهادی چلبی کە شیعە و لە دەرەبەگەکانی گەورە و یەك لە کەسایەتیە سیاسی و دەست رۆیشتوی مەسەلەکانی سیاسی و ئابووری عێراق بوو. هەروەها سەرتیپ مهداوی سەرۆکی رێکخراوی ئیتلاعات و ئەمنیەتی عێراق، داوەت کران کە بێنە ئێران. هەردووك داوەتی دەوڵەتی تارانیان قبوڵ کرد و هاتن بۆ ئێران. میوانداری ئەم جۆرە میوانانە لە کارمەندانی بەشی پەیوەندیدار و یا لەو کەسانە هەڵدەبژێردران کە زمانی میوانەکانیان دەزانی.

چەلەبی شارەزای چەند زمان بوو لەوانە زمانی فارسیش. هەردووکیان چەند رۆژێك لەتاران و شیراز و ئەسفەهان بۆ دیتنی شوێنە مێژووییەکان گەڕان و دەبوایە چەند رۆژێکیش لە باکووری ئێران بەپێی بەرنامە رابوێرن، بەڵام سەرتیپ مەهداوی رۆژێك پێش چونیان بۆ شیمال.

گوتی: زۆر نیگەرانم و هەست دەکەم کە کارەساتێکی ناخۆش لە بەغدا روو دەدات. لەبەر ئەوە داوای لێبوردنم هەیە بۆ سەفەرەکەی شیمالی ئێران و دەبێ بچمە بەغدا. هەرچی چەلەبی و ئێمە باسمان لەگەڵ کرد کەشتی وا نییە و لە خۆڕا خۆت نارەحەت دەکەی، فایدەی نەبوو. دوایماڵ ئاوایی لەگەڵ سەرۆکەکانی سەرەوەی ساواك بەرەو بەغدا فڕی، بەڵام عبد الهادی چلبی بە پێی بەرنامەی سێ رۆژ لە شیمال و دوو رۆژ لە تاران مایەوە و دوایی بەرەو بەغدا تێی تەقاند.

من بۆ ماموریەتێکی ناوچەی کوردستان نێردرام هەواڵی دەست پێ کردنی شۆڕشێکم لە عێراق پێ گەیشت خەبەرەکەم بە تەلەگراف لە سەقزەوە بۆ تاران نارد، وەڵامی ئەم تێلگرافە و چونی نهێنی من بۆ عێراق و ناوچەی کوردستانی عێراق و سەرهەڵدانی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ و پاشان چونم بۆ عێراق وەك ماموریەتی سابیت کە لەسەرەوە ئیشارەیەکی بچوکم پێ کردووە و وتووێژ

لەگەڵ زۆربەی بەشدارانی شۆڕش وە دەست هێنانی خەبەری دەقیق لە سەر شۆڕش و کودیتاکانی دیکە کە لە ماوەی پێنج ساڵەی خزمەتم رووی داوە لە وتارێکی جیاوازدا بە درێژی بە ئاگاداری خوێنەرانی خۆشەویستی دەگەیەنم.

باسی ئەوەم کرد کە لە خانووی تازە ئیجارەی ماڵی برادەر عبد الهادی چلبی کە دوای شۆڕشی ٥٨ رای کردبوو بۆ لوبنان نیشتەجێ بووم. لە یەکەم رۆژەکاندا هەستم کرد لە ژێر چاودێری پیاوەکانی ئەمنی عێراقدام وە سەرخۆم نەهێنا، بێ ئەوەی خەتایەك بکەم و سەرنجی ئەوان راکێشم وەك ئەتاشەی نیزامی کاری رۆژانەی خۆم دەکرد. هەموو رۆژێ زۆرتر دەکەوتمە ژێر چاودێری ئەگەر رۆژەکانی هەوەل فولکس واگونیك وەدوام دەکەوت، یەکی دیکەش زیادی کرد. لەبەر ئەوەی لە ئینگلستان و ئێران دەوری ئەم کارەم دیبوو، ئاگاداری تەواوی هەڵس و کەوتی پیاوەکانی ئەمنی عێراق بووم. کاری وام دەکرد کە بڕوام پێ بکەن و دەست لە راوەدوو چاودێریم هەلگرن. لە دانیشتنەکانمدا لەگەڵ کارمەندانی باڵوێزخانە لە کونسولگەری بەغدا، یا لەگەڵ ئێرانی و یا عێراقی وام نیشان دەدا کە جگە لە یاریدەدەری ئەتاشەی نیزامی ئیشی دیکەم نیە و هەر حەز لە مەسەلەکانی ئاگاداری ناکەم کە لە ئەرکی خۆم بەدەر بن، چونکە دەمزانی دەبێ کارمەند یان کرێکاری سەر بە ئەمنی عێراق لە باڵوێزخانەی ئێراندا هەبن. لەگەڵ ئەوانە جۆرێك دەبزوتمەوە کە وابزانن بە راستی یاریدەری ئەتاشەی نیزامیم و هیچ کاری دیکەم پێ نەسپێردراوە و بەرپرسیەتیم نیە. ئەوان راپۆرتی رۆژانەی خۆیان دەدا بە ئەمنی عام. تا وەدووا کەوتن و چاودێری من کەم دەبووەوە پاش ماوەیەك دەستیان هەلگرت بەلام دلنیا نەبووم چونکە هەستم دەکرد تەلەفونی ماڵێ کۆنترۆڵ دەکرێ و جاروبار وە دوای خۆم و ماڵ و منداڵ و تەنانەت شۆفێرەکەشم دەکەوتن، ئەوانم فێر کردبوو لە جم و جۆلی مامورەکانی عێراقی کە زۆربەی نەزانانە بوو ئاگادار دەبوون. لە مەدرەسەی شەرافەتی ئێرانیان لە بەغدا و هەروەها لە

دەبیرستانی کچانەی فەرانسەیش بە شێوەی جیاواز منداڵەکانیان چاودێری دەکرد و لە بارەی ئەرك و کاری من پرسیاریان لێ دەکردن. چونکە لە ووردەووردە تێکۆشانی خۆم لەگەڵ هاتوچۆی سەرکردە و پیاو ماقولانی کورد و هەروەها ئەفسەرانی عێراقی دەست پێ کرد. هەڵبەت دیارە ئەم کارە ئەوەندە ئاسان نەبوو کە بە دوو دێڕ لێرەدا باسی بکەم. بۆ نمونە ئەگەر ویستبام کەسێکی وەك جەلال تاڵەبانی لەناو کوردەکان یان سدیق شنشل لە پارتی قەومیەکان - ی عێراق ببینم، بە لانی کەمەوە چەند مانگ یان ساڵێکی هەر دەخایاند، بۆ ئەم دیتن و وتووێژانە کەلەلاو رێگای جۆراو جۆر لە بەرچاو دەگیران کە بە گوێرەی کات و شل و توندی زیرەوانی و هەڵکەوت و بارودۆخی کەسەکان فەرقی دەکرد. ئەنجامی هەر گەلاڵەیەکیش کە دەگەیشتە چاوپێکەوتن و وتووێژێکی ئاسایی، پێویستی بە خەرج و کات و شوێنی لەبار و کەسانی بڕوا پێ کراو هەبوو. چونکە ئەنجامی کردەوەی تایبەتی و بە هەستی دژی راو نان و چاودێری و هەڵەیەکی بچوك گیروگرفتی زۆری بۆ هەردوو لای چاوپێکەوتن ساز دەکرد. ئەوەش لە رۆژگارێکدا کە ساڵێك بەسەر شۆڕشی ٥٨ دا تێنەپەڕی بوو، دەزگای ئاگاداری قەومی کە بەشداری و تێکۆشانی رووسەکان و هاوکاری ولاتانی پشتی پەردەی ئاسنی دامەزرا بوو، وایان ئەزانی بە رەوشتێکی کە ژەنەراڵ عبد الکریم قاسمی سەرۆکی وەزیر کردویەتیە بەر، پاش ماوەیەك عێراقیش دەچێتە پشتی پەردەی ئاسنی، بە توندی دیبلۆماتەکانی بێگانە بە تایبەت ولاتانی رۆژئاوا و ئێرانیان خستبووە ژێر چاودێری تەواوەوە. یەکێك لە مەبەستەکانی من دیتن و پەیڤین لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی، رێبەری پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوو. کە دوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەت بۆ بەغدا لە ماڵی فیصل - ی کوژراوی کوڕی نوری سعید، سەرۆك وەزیری مردوی کاتی سەلتەنەت، نیشتەجێ ببوو. دەوڵەتی عێراق چەند ماشێن و شۆفێر و

خزمەتکاری بۆ مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی تەرخان کردبوو، کە هەمویان فێرکراوی سازمانی ئەمنیەتی عێراق بوون.

لێ گەڕێین با واز لە باسی چاوپێکەوتنی خۆم لەگەڵ مەلا مستەفای بێنم و باسی شەخسیەتی ئەم مەلای نا مەلایە بۆ خوێنەرانی بەڕێز بکەم کە بۆتە مامۆستا. چونکە لەو مەسەلانەدا کە پاشان لەگەڵیان ڕووبەڕوو دەبین مەلا لە هەموو ڕووداوەکاندا دەبینەری، و لە یاریەکانی بە قەولی خۆی سیاسی و لە راستیشدا ناڕاستی و لاڕێی دەوریکی گرنگی دەبێت هەر چەندە چەندین ساڵە کە خەڵکی ئێمە بەم ناوە گەورە بەڵام بەتاڵە ئاشنان هیچ زانستیەکی ئەوتۆیان لەسەر شەخسیەت و کاراکتێر و شەرحی حاڵی ئەو نیە.

وا بەناوبانگ و مەشهورە کە بارزانی عەشیرە و تایەفەیەکە، بەڵام بە پێچەوانەوە بارزان پێشتر گوندێك بووە لە ناوچەی شارستانی دهۆك و سەر بە ئۆستانی هەولێر لە ناوچەی هەرە باکووری کوردستانی عێراق، خەڵکێکی زیرەك نەبەز بەرێبەرایەتی، ڕێبەری ئایینی شێخ بابۆ، بابی مەلا مستەفا لەوێ دەژیان. خەڵکی ئەم گوندە لە باری کرمەڵایەتی و عەشایەریەوە دەگەڕێنەوە سەر تایەفەی زێباری، هەرگیزا و هەرگیز بارزان یان بارزانی وەك عەشیرە، تایەفە یان عیل نەبووە. ئەوە کە دەڵێن عیلی بارزان بەرێبەرایەتی مەلا مستەفا شۆڕشی کردووە، ڕاست نیە.

مستەفا دووەمین منداڵی شێخ بابۆ و شێخ احمد هەوەڵین کوڕی گەورەی کە دوای کۆچی دوایی بابی، بووە بە جێ نشینی ئەو وەك ڕێبەرێکی ئایینی. مستەفا نە تەنیا هەرگیز نەچۆتە مەدرەسە، بەڵکە لە لای بابیشی کە کۆلکە خوێندەواریەکی هەبووە هیچ فێر نەبووە، تا کاتی مردنیشی کە بە نەخۆشی سەرەتانی خوێن لە واشنتۆن دی. سی گیانی دا، جگە لە ئیمزایەکی خوار و هیچ نوسینێکی لە پاش بەجێ نەماوە وەك پیاوە پیرەکانی کۆنی گوندی بارزان باسی ئەکەن، بە تەشەر و سوکایەتی نازناوی (مەلا) یان لێناوە. لەبەر خوێندنەوەو

نوسینی زۆر !! گەیشتۆتە پلەی مەلایی لەو کاتەی کە ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر عێراقدا گرتبوو، لە دوای شەڕی یەکەمی دنیاگیر، کە عێراق لە دەوڵەتی عوسمانی جیا کرایەوە لە شوێنە حەساسەکانی باکوور و باشوور سەرکۆنسولەکانی ئینگلیز سەقامگیر بوون. مەلا مستەفا لە کاتی لاوێتیدا، لە پێشدا وەك کرێکار لەسەر شەقام و ڕێگاو بان کاری دەکرد و دوایش وەك سەر کرێکار هەر لەو سەروبەندەدا بوو کە لە سلێمانی لەگەڵ نوێنەری ئینگلیزەکان، سەرهەنگ ئیدمۆند پەیوەندی کرد. بە دوای ئەم پەیوەندییەدا دەستی کرد بە ئیشی شەریفی جاسوسی بۆ ئەوان.

دوای چەند ساڵ دەستی لە ئیشی ڕێگا و بان هەڵگرت و چۆوە بۆ ناوچەی خۆی و دەستی کرد بە کۆکردنەوەی خەڵکی چەکدار. دوای مردنی بابی چونکە شێخ احمدی برای گەورەتر، جگە لە کار و باری ئایینی خۆی لە کاری دیکە وەرنەدەدا، بە ناچاری مەلا مستەفای کرد بە بەرپرسی کاروباری کۆمەڵایەتی و عەشایەری خەڵکی بارزان.

ئەگەر خەڵکی بارزان گوێیان بۆ مەلا مستەفا ڕا دەگرت، لەبەر توانای ئایینی شێخ احمد بوو نەك کەسایەتی مەلا مستەفا چونکە تا ئەو دەم نە شەڕێکی کردبوو، نە ئازایەتی و کەسایەتیەکی لە خۆی نواندبوو ئەگەر ئینگلیزەکان یان دەوڵەتی عێراق لە سەردەمی سەربەستیدا لە ناوچەی سەروکارێکیان هەبایە زیاتر دەچونە لای محمود ئاغای زێباری کە لە بارەی عیلی و ژمارەی خەڵکی شەڕ کەر و عەشیرەتی بەسەر عیلەکانی تردا زیدەیی هەبوو. نەك مەلا مستەفا یان کەسانی تر. لە شەڕی دووەمی دنیاگیردا، پاش داگیر کردنی ئێران لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە، لە سەرەتاوە رووس و ئینگلیز و پاشان ئەمریکا، مەلا مستەفا بە یارمەتی بەرزانیان لە باکوری عێراق دەستی کرد بە سەربزێوی و یاخی بوون و دزی. لەبەر ئەوەی ئەرتەشی عێراق ئەم کارانەی پێ قبوڵ نەئەکرا، ناچار پۆلێکی سەربازی بۆ لێدانی مەلاً مستەفا نارده باکور. مەلا مستەفا خۆی

پێ ڕانەگیرا چووە ئێران و لە مهاباد کاتێکی کۆماری کوردستان بە ڕێبەرایەتی قازی محمدی ئیعدام کراو دامەزرا، لە مهاباد نیشتەجێ بوو چەند کەس لە ئەفسەرانی ئەرتەشی کورد زمانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لەگەڵ مەلا مستەفا کەوتبوون و خەریك بوون کە سەربزێوی و دزی چەکدارانەی مەلا مستەفا بکەنە بزوتنەوەیەکی حیزبی لە لایەن ئەرتەشی ناردراو بۆ باکوری عێراق گیران و هەر لە ناوچەی باکور گوللە باران کران، مەلا مستەفا و ئەوانەی لەگەڵ ئەو هاتبوونە مەهاباد لەگەڵ لەشکری کوردستان کەوتن و دەست بە جێ ئۆنیفورمی نیزامی دەبەر کرد و بوو بە ژنرال و دەستی کرد بە جاسوسی و تێکدەری و پێکهێنانی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی ئێرانی بەدەر لە ناوچەی کۆماری کوردستان. لەگەڵ چەند کەس چووە تاران و لە باشگای لەشکری دووەمی ئەو دەمی لە لایەن سەر لەشکر رەزم ئارا سەرۆکی ستادی ئەرتەشی ئەودەم میوانداری لێ کرا. ناوبراو لەگەڵ خوالێخۆشبوو سەر لەشکر رەزم ئارا و هەروەها وەزیری شەر سپەهبود امیر احمد و قوام السلطنة سەرۆك وەزیری ئەو کات دانیشت و چاوپێکەوتنی هەبوو. لەو دانیشتنانەدا چەند پێشنیاری کردبوو بۆ لە بەین بردنی قازی محمد و هاورێکانی و هەروەها داوای کردبوو لە دەوڵەت و ئەرتەش کە چەکەمەنی پێویست بدرێتێ و ئیمکانی مانەوەی خۆی و هاورێکانی لە مەهاباد پێك بێت. زوو زوو داوای دەکرد کە بچێتە لای شا و چاوی پێی بکەوێت. لەگەڵ ئەوەی چەند جار لەگەڵ شا باس کراو بەرپرسەکانی دەوڵەتیش ئەم چاوپێکەوتنەیان هەرچەند تەشریفاتیش بایە بەڵام بۆ دڵ گەرمی پێیان باش بوو.

هەرگیزا و هەرگیز لەگەڵ ئەم چاوپێکەوتنە موافەقەتێك نەکرا، شا ئەسڵەن لە فیکریشیدا نەبوو کە بە چاو پێکەوتنی لەگەڵ چەنەراڵێکی قولابی ئەویش مەلا مستەفای بەرزانی هەڵاتوی لە عێراق کە پەنای هێناوە بۆ کۆماری کوردستان رەوایەتێك بۆ ئەوە کۆماری و کۆماری کوردستان قایل بێ شا و ئەرتەش لەسەر

ئەم باوەڕە بوون كە ئەگەر مەلا مستەفا دەیهەوێت لە ئێران بمێنێتەوە دەبێ چەك دانێ و لەو شوێنەی دەوڵەت بۆی دیاری دەكا نیشتەجێ بێت و دەوڵەتیش خەرجی ژیانیان بۆ دابین ئەكات.

دیار بوو كە مەلا مستەفا بەوە رازی نەبوو بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لەدەست دەوڵەتی ئێران رزگار بكات. قەولی دا كە بگەڕێتەوە مەهاباد باسەكەی لەگەڵ ئەو خەڵكەی كە لە عێراقەوە لەگەڵی هاتبوون بهێنێتە گۆڕێ و ڕای ئەوان بۆ ویستی ئێران راكێشێ و بۆ بەجێ گەیاندنی ویستی ئێران هەنگاو بنێ تەنانەت بەڵێنیشی دابوو كە ئەگەر ئەرتەشی ئێران بۆ رووخانی كۆماری كوردستان وەرێكەوێ هاوكاری لەگەڵ بكات. ئەم مەلای نامەلایە هەر كە گەیشتەوە مهاباد لە جیاتی وتووێژو هێنانە گۆڕێ باسەكە، یەكسەر دەستی كرد بە كۆكردنەوەی چەك و قورخانە و خۆی بۆ بەرەنگاری ئەرتەشی ئێران ئامادە كرد. ١

دوای هاتنەوەی ئەرتەش بۆ ئازەربایجان و دوایش كوردستان (مهاباد)، مەلا مستەفا نەك هەر هیچ هاریكاری لەگەڵ ئەرتەش نەكرد بەڵكو لەگەڵ پێنج سەد كەس لە هاورێكانی مهابادیان بە جێ هێشت و چونە سەر چیاكانی سەر سنوری عێراق و توركیا. ستونێكی نیزامی بۆ لەبەین بردنی ئەوان یان وەدەرهێنانیان لە ئێران بە سەركردایەتی سەر لەشكر هومایونی بۆ ناوچە نادرا. دوای شەڕێكی توند و كوشتن و بەدیل گیرانی چەند ئەفسەر و دەرەجە دار، مەلا مستەفا و هاورێكانی دوای زەختی ئەرتەشی عێراق دیسان هاتنەوە بۆ ناو خاكی ئێران و بە شێوەی پاشەكشێی سەركەوتووانە ! چونە ناوچەی شنۆ و دوایی زێوە و قوتور و لە رێگای پلدشت خۆیان گەیاندە جلفا، لە كاتێكدا كە سۆڤیەتیەكان بە دەرگایەكی ئاوەڵاوە چاوەڕوانیان بوون لەوێ بوون بە پەنابەر.

ئەمە یەكێك لە هەزاران فێڵ و تەڵەكەی ناجوامێرانە و بێوەفایی مەلا مستەفا بوو كە دوایی و لە جێگای خۆی هونەرەكانی ! دیكەی ئەم مەلای نامەلایە دێنمە پێش چاوی خوێنەرانی بەرێز.

مەلا مستەفا و پیاوەکانی بەرێ کران بۆ ناوچەی باکۆ کەوتنە ژێر چاودێری سەرکردەکانی هەڵاتووی دیموکرات وەك پێشەوەری وغلام یحیی و زەنەراڵی قولابی و پناهیان. لەبەر گەلێك هۆی جیاواز کە باسکردنیان پێویستی بە چیرۆکی دوور و درێژ هەیە، سەرنجی رووسەکانی ڕاتەکێشا ن دایم خەتابار دەکرا کە بیری دەرەبەگی و پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیسەکان هەیە. پیاوەکانی بە کاری جۆر و جۆر سەرگەرم کران و زۆربەیان کچی رووسیان مارە کرد و هیچ کاتیش ئیزنی رۆیشتن بۆ جێگا و ناوچەی دیکەیان پێنەدەدرا. جەنابی مەلا کە دایم لە فیکری مفتەخۆری و چەوساندنەوەی خەڵکدا بوو، هاواری رەخنەی لێ هەستا کە بوو بە هۆی دوور خستنەوەی بۆ سیبیری و یەك دوو ساڵ ئاوی فێنکی دەخواردەوە کاتێ زمانی گرێ درا هێنایانەوە بۆ جێگای هەوەڵی.

بە هاتنی هاوینی ١٩٥٨ قرچەی گەرما لە بەغدا و ناوچەکانی باکوور و رۆژهەلاتی ئەوێ مێشکی سەرکردەکانی نارازی ئەرتەش و سیاسەتمەدارانی عێراقی گەرم داهات، بە گوێرەی بەرنامەی لە پێشدانراو دوو سەرکردەی ئەرتەش بەپێی قەراردادی هاوکاری نیزامی عێراق و ئەردەن کە دەبوایە چوبن بۆ عومان پایتەختی ئەردەن لە بەغدا کردیانە کودیتا یان بە قەولی خۆیان شۆڕش.

سەرتیپ عبد السلام عارف و سەرتیپ عبد الكريم قاسم کە هەردوکیان لە ئەفسەرانی بە دیسیپلین، بە ئیمان، ڕستگۆ و سەرکردەی ئەرتەش لە لەشکری پێنجی بەعقوبە بوون دوای پێکهێنانی تەشکیلات و پەیوەندی لەگەڵ سەرکردەکانی حیزبی دژی دەوڵەت، کە تێکۆشانی نهێنییان هەبوو، هەروەها پەیوەندی و وتووێژ و راکێشانی ویستی سەرکردەکانی کورد چ حیزبی و چ غەیرە حیزبی و شاعیری، لە کاتی تێپەڕ بوونی پۆلی نیزامی لە بەغدا و بەرەو ئەردەن لە شەوی ١٤ی جولای ١٩٥٨ کودیتایان کرد. هەر لەسەرەتادا دەسەڵاتی تەواویان گرتە دەست و هەوەڵین ڕاگەیاندنی شۆرای بەرزی شۆڕشیان بە

قازانجی گەل ! لە ڕادیۆ بەغدا بڵاو کردەوە، چیرۆکی ووردی ئەم کودیتایە و نەخشی دەوڵەتی ئینگلیز لە کاتی سەرۆك وەزیری ژەنراڵ نوری سعیدی بە ڕەگەز کوردی خوێنەوار و پەروەردەی مەکتەبی ئینگلیز و یەك لە دۆستان و لایەنگرانی ئینگلیز کە بەدەستی خەڵك کوژراوە و لەت لەت کرا. هەروەها ملك فیصل ی دووەم پاشای لاو و عبد الاله نایب السلطنة کوژران.

وا بیر ئەکەمەوە جگە لە بەشێك ڕووداوی نهێنی ئەم کودیتایە، کتێبێکی زۆر بە چەندین زمان لەسەری نوسراوە. من ئاگادارییەکی زۆرم لەسەر ئەم کودیتانە لە لایەن دۆستان و هاوڕێیانی سەرۆکەکانی کودیتا کە لە عێراق بووم وەدەست هێناوە کە لە کاتی خۆی و لە جێگای تایبەتی بۆ خوێنەرانی بەڕێزی باس دەکەم.

بە پێ مادەی ٣ ی هەوەلین ڕاگەیاندنی شۆرای بەرزی شۆڕش کوردەکانی عێراق وەك نەتەوەیەکی جیا لە نەتەوەی عەرەب ناسران، دەوڵەتی شۆڕشگێڕی قەولی دا کە بۆ مافی کۆمەلایەتی و سیاسی ئەوان لە هەوەلین کاتدا هەنگاو هەڵدەگرێ، ئەمە هەر ئەو بەرنامەیە بوو کە لە پێشدا سەرۆکەکانی کودیتا و حیزبەکانی هاوپەیمانیان لەسەری پێك هاتبوون. شۆڕشی ١٩٥٨ ی عێراق سەرەتای ئاڵ و گۆڕێکی گەورە بوو لە بواری سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری عێراقدا.

هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی بەغدا و چونی عێراق بۆ ناو وڵاتانی دراوسێ پێکهێنا کە هەر کام لەم وڵاتانەش بەش بە حاڵی خۆیان بۆ لە ناوبردنی ئەم گیروگرفتیانەی کە ڕۆژ بەڕۆژ پتر ئاشکراتر دەبوون کەوتنە سەر فیکری چارەسەرکردنی. لەوانە دەوڵەتی ئێران بڕیاری دا بۆ پتەوتر بوونی پەیوەندی سیاسی ئەوەی لە توانایدا هەیە بۆ ڕواڵەتیش بێ بیکات، بۆ ئەم ئیشە سپهبدنادرباتمانقلیج باڵوێزی کاتی کودیتا بانگ کراوە بۆ ئێران و شەخسیەتی گەورە و دۆستکار عباس ئارام کە بە ڕاستی ناوێکی پڕ لە مانا بوو (هەم

عەبوس و هەم ئارام) لە وەزارەتی دەرەوەی دیاری کراو وەك سەفیر کەبیر بۆ بەغدا ناردرا.

تا کاتی چونم بۆ عێراق وەك یاریدەدەری وابەستەی نیزامی (بە دەرەجەی سەرگوردی) و بەرپرسی نوێنەرایەتی ساواك زۆر رووداوی بەرچاو رووی دا بوو. لە ڕاستیدا لە ماوەی ساڵێك و چەند مانگ دوای کودیتا کە ئەمن لەسەر ئیشی تازە سەقامگیر بووم، بەقەدرایی ■■ ساڵ عێراق و لاتانی دراوسێ توشی گیروگرفت و قرە و رووداو و ئاڵوگۆڕی سیاسی ■ شتی تر بوون.

بۆ پتەو بوونی پەیوەندی سیاسی و دۆستایەتی و دراوسێیەتی پەیامێکی زۆر بۆ سەرۆك وەزیری کاتی عێراق ژەنەراڵ عبدلکریم قاسم ناردرا کە دوای لابردنی عبد السلام عارف هاوکاری کودیتاچی لە عێراقدا ببوە خاوەن دەسەلات و توانای یەکتا. بەلام دەنگی تفەنگ و چەکی قورس ■ خۆ پیشاندانی خەڵکی، دوای ئەوە■ هەموو ساڵە بێ دەنگی و نەبوونی ئازادی و دیموکراسی گوێی عبد الکریم قاسمی کپ کردبوو، بە هیچ شێوەیەك کەس وەلامی لە باری لێ نەدەبیست،، تەنیا ئەوە نەبێ کە لە قسەکانیدا عێراقی سەربەخۆ و خۆی بە چەپ و ئازادیخواز لایەنگری سیستەمی سۆڤیەت نیشان بدات، بە ئازادی گشت حیزب و کۆمەڵی سیاسی و بلاوبونەوەی رۆژنامە و گۆڤاری گەورە و بچوکی ڕەنگا ■ ڕەنگ کە سیاسەتی ولاتانی دراوسێ پەلاماری بدەن و هەموو هیوا و ئومێدێکی دەکردە نائومێدی. کاتێك کە ڕەخنە دەگیرا لە بەرانبەر ئەم رۆژنامە ■ گۆڤارانەدا دەوڵەتی عێراق لە وەلامدا دەیگوت کە لەم ولاتەدا ئازادی هەیە ئەوە هەر ئەم شتەیە کە خەڵك شۆڕشیان بۆ کردووە بە ئامانجی خۆشیان گەیشتون. لێرەدا وام پێ باشە کە بۆ گۆڕینی تام و چێژی ئەم باسە، باسێکی تایبەتمەندی ولاتەکەمان ئێران شی بکەمەوە.

دوای چونم بۆ عێراق و سەقامگیربوونم لە باڵوێزخانەی ئێران رۆژێك لە خوالێخۆشبوو عباس ئارام سەفیر کەبیری ئەوکات کە دوای شۆڕشی ئێران گیرا و

دوای یەك دوو ساڵ لە زیندان هاتە دەرو دوایش مرد، بیستم کە : رۆژێك بوو بۆ وەرگرتنی فەرمان و رێنوینی پێویست چۆتە خزمەت شا و لەسەر پەیوەندی ووتووێژێکی کردووە ئارام گوتی:

"شا لەبابەت هەل و مەرجی عێراقەوە داوای رێگاچارەیەکی لە من کرد کە چۆن دەکرێ چارەسەری ئەم ناکۆکیە بکرێت". وەڵامم دایەوە " شۆڕشێك کراوە، ئێستاش گەرمای شۆڕشەکە سەرکردەکانی شۆڕش یان کودیتاکەی (جیاوازی هەیە لە بەینی شۆڕش و کودیتا، کە هەڵبەت لە عێراق کودیتا کراوە، بەلاّم بە هەڵە ناوی شۆڕشی لەسەر دانراوە و ئەمە شتێکی نوێ نییە، ساڵەهای ساڵە کە چەند کەسێك لە ولاّتێك بە حکومەت و نیزامیکی تایبەتی دەست دەکەن بەناڵ و گۆڕی بە وەسیلەی ئەرتەشیەکان و بۆ شوێن وون کردن چەند کەسی غەیرە ئەرتەشیش لەگەڵ دەخەن و کودیتا دەکەن و بە ناوی گەل و بەرژەوەندی خەڵك ناوی "شۆڕشی" لەسەر دا دەنێن) لە تینی خۆی راگرتووە. دەبێ پشومان لەسەرخر بێت و کەڵك لە هەلی کات ورگرین بە هێدی دەست بەکار بین، شا بە نارەحەتییەوە گوتی: "هەموو رۆژێ لە رۆژنامە و گۆڤار و جارو باریش بە تەشەر لە رادیۆ بەغدا هێرشمان دەکەنە سەر" رۆژرنامەی خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق نە تەنیا هێرش، بەڵکو سوکایەتیشمان پێ دەکات و ئەوەمان پێ قبوڵ ناکرێ، لە وەلاّمی رەخنەی ئێمەدا تا ئێستا هەر ئەوە بووە کە دەوڵەتی عێراق گوتویەتی : دەوڵەت کاری بە بەشی راگەیاندن و رۆژرنامەگەری نەداوە و ئازادی دیموکراسی لە عێراقدا هەیە" بە شا - م گوت : کە قبوڵی بکە لە گەڕانەوەمدا بۆ بەغدا داوای چاوپێکەوتنی سەرتیپ عبد الکریم قاسم سەرۆك وەزیر بکەم و سەرزارەکی لەم بابەتەوە لەسەر پەیوەندی هەردوو ولاّت لەگەڵی بدوێم، بەڵکە نەتیجەیەك هاتە دەست لەگەڵ ئەزەری من موافیق بوو.

هەر چوومە بەغدا داوای دیتنی سەرۆك وەزیرم كرد. هەڵبەت ئەمە هاوكات لەگەڵ ئەوە بوو كە لە شارع الرشید كە یەكێك لەشەقامە بەناوبانگەكانی بەغدایە لە لایەن موخالیفانی دەوڵەتەوە كە لە دواییدا ئاشكرا بوو لە لایەن حیزبی بەعسی عێراق بە وەسیلەی صدام حسینی تكریتی و علی صالح سعدی سەرۆكی مەجلیسی ئێستای عێراق كە هەردووكیان ئەوكات دانیشجوی حقوق بوون تەقەیان لە ماشینی عبد الكریم قاسم كردوە، كە بو بەهۆی كوشتنی شۆفێر ناجودانەكەی و بریندار بوونی دەستی راستی و بەم شێوەیە نەجاتی دەبێ. ئەو دوو كەسە هەر ئەوكات دەرباز دەبن و دەچن بۆ سوریە كە ناوەندی سەرەكی حیزبی بەعس بووە.

دوای ماوەیەك بە شێوەی نهێنی دەگەڕێنەوە بۆ عێراق و هەوڵی روخانی دەوڵەتی عبد الكریم قاسم دەدەن. هەر لەم سەرو بەندانەدا ژەنەراڵ عبد السلام عارف، رەفیقی لە مێژینە و هاوكاری كودیتای عبد الكریم قاسم لە بەندیخانە بوو كە دوای دوو ساڵ زیندانی لە رۆژی جێژنی قوربانی ساڵی ١٩٦٠، عبد الكریم قاسم بۆ خۆی دەچێتە بەندیخانە و عبد السلام عارفی بە ماشێنی خۆی دەیباتەوە ماڵێ و فراوین پێكەوە دەخۆن، عبد الكریم قاسم قەولی دەداتێ كە لە زووترین كات دیسان چاوی پێ دەكەوێتەوە و تۆڵەی رابردووی بۆ دەكاتەوە و ئیدی بەجێی دێڵێ.

عبد السلام عارف لایەنگری قەومیەكان یان بە ڕ واڵەت لایەنگری یەكگرتنەوەی عەرەب و یەك لە لایەنگرەكانی توندی عبد الناصر سەرۆك كۆماری میسر بوو، ناوبراو لەگەڵ حیزبی بەعس بە رێبەرایەتی سەرتیپ احمد حسن بكر تكریتی خاڵی صدام حسین تكریتی شۆڕشی ١٩٦٣ پێك دێنن كە دەبێتە هۆی كوشتنی سەرتیپ عبدالكریم قاسم سەرۆكی دەوڵەتی ئەوكات. تێكۆشانی ئاشكراو نهێنی ئەوان و كودیتای ١٩٦٣ كە لە ماوەی مامۆریەتی من لە عێراق روویدا، بۆ خۆی

حەكايەتێكی تايبەتی هەيە كە لە هەوەلين فرسەت لێرەدا يان لە نوسينێكی دیكەدا خوێنەرانی بەرێزی لێ ئاگادار دەكەم.
با بادەينەوە سەر هەوڵی خوالێخۆشبوو عباس ئارام سەفير كەبيری ئەوكاتی ئێران سەبارەت بە ديتنی سەرتيپ عبدالكريم قاسم. دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا و دوای چاوپێكەوتنەكەی دوای ماوەيەكی زۆر كە لەگەڵ ئەخلاق و دابی ديپلۆماسی نەدەهاتەوە كاتی چاوپێكەوتن ديارى كراو لە لايەن وەزارەتی دەرەوە پێی ڕاگەيێندرا. ئارام درێژەی بە قسەكانی دا و گوتی: بيرم لێ دەكردەوە چی بكەم لە كوێوە دەست پێ بكەم و دەبێ چ بڵێم چ كەسێك لەگەڵ خۆم بەرم. فيكرم كردەوە كە باشتر وايە لەگەڵ جعفر ڕائيد سكرتێری يەكەمی باڵوێزخانە كە زمانی عەرەبی باش دەزانی و وابەستەی نيزامی كاتی سەرتيپ منصورپور كە بەرپرسی نوێنەرايەتی ساواك لە بەغدا بوو، بۆ ديتنی سەرۆك وەزيری عێراق بڕۆم.
هەر ئەو كارەشم كرد و لە كات و ڕۆژی ديارى كراو چووينە وەزارەتی بەرگری كە جێگای ئيش و ژيانی سەرۆك وەزير بوو. بە ميهرەبانی و دڵێكی فراوانەوە ئێمەی وەرگرت، دوای خواردنەوەی چايی باسی دۆستايەتی كۆن و تازەی هەردوو وڵاتم بۆ كرد و سڵاو و درودی شای ئێرانم پێ ڕاگەياند درێژەم پێ دا كە شا زۆر حەز بە دۆستايەتی هەردوو وڵات دەكا، بەو پێيەی كە ئێرانيەكی زۆر لە عێراق دەژی و زۆربەی خەڵكی عێراق شيعە و برای دينی ئێرانيەكانن باش نيە كە پەيوەندی هەردوو وڵات سارد بێت و هەموو ڕۆژێ لە گۆڤار و راديۆی عێراقدا سوكايەتی بە دەوڵەت و ميللەتی ئێران و بە تايبەتی بە شەخسی شا بكرێ. لەماوەی قسەكانی من سەرتيپ عبد الكريم قاسم هەر كوێ بوو و يەك ووشەش لە زاری نەهاتە دەرێ. لە جێگای خۆی هەستا و دەرگای وە تاخێكی چكۆڵەی كە لە پشت مێزی كارەكەی بوو كردەوە و دواوای لێ كردين كە بچينە ئەوێ فەرشێكی ئێرانی و تەختە خەوێك و مێز و كورسی و چەند

کۆمیدی دار زوورە خەوەکەی پڕ کردبۆوە، عبدالکریم قاسم دەرگای یەك لە کۆمیدی لیباسەکانی خۆی کردەوە و گوتی: جوان چاوی لێ بکەن.
دەستێك لیباسی سەربازی لە خوێن هەڵکێشراومان دی کە لەوێ هەڵواسرا بوو. دوایی گوتی: من بەم وەزعە و کەسانی خەڵکی ئاوا کە نە تەنیا لەگەڵ ئێوە دوژمنایەتیان هەیە و لە رۆژنامە و گۆڤاردا بە ئاشکرا و نهێنی بێحورمەتی ئەکەن. بەڵکو دوژمنی گیانی منیشن ئەمانە هەر ئەو کەسانەن کە لە شارع الرشید چەند مانگ لەمەو بەر هێرش و تەقەیان لێ کردم کە بە کەرەمی خودا بۆ خزمەت بە خەڵك ولاتەکەم نەجاتیم هات. هەر لەم کاتەدا قۆڵی کراسەکەی هەڵداوە و جێی برین و فیشەکەکانی پێ نیشان داین، چوینەوە بۆ دەفتەری کارەکەی و گوتی: سلاو و ئیحترامی من بە شا بگەیەنن و ئارەزووی سلامەتی و بەختەوەری و سەرکەوتنی بۆ خزمەت بە ولات ومیللەتەکەی بۆ ئەکەم. پێی رابگەیەنن کە ئێمە و میللەت ئێمە دژی زوڵم و زۆرداری شۆڕشیان کردووە، ئێستاش تیشکی شۆڕش لە ولاتی ئێمە هەر کرشەی دێت، ئەمە نمونەیەك بوو کە پێتانم نیشان دا. ئێمە روخێنەری رژێمی پاشایەتی و تێکدەری پەیمانی بەغداین. عێراق و خەڵکی عێراق دەبێت چاك بناسن و دەبێ بزانن کە عێراق یانی بەردی سەخت و خەڵکەکەشی وەك ناوەکەی قایم و لاسار، هەر چەند کەلە چەند میللەت بە دین و ئاینی جیاوازەوە پێك هاتووە، بەلام بۆ وەدەست هێنانی قازانجی هاوبەشی نەتەوەیی هەموو یەك دەنگ و یەك رەنگن. هەروەکی لە شۆڕشەکەی ٥٨ دا دنیا بە باشی دیتی کە میللەتی عێراق بە تێکڕا هەستا و شۆڕشی کرد. بەم پێیە بەو ماوە کەمەی کە هێشتا خوێنی شەهیدەکانمان ووشك نەبۆتەوە ئێمە ناتوانین ئەو پەیوەندیەمان هەبێ کە لە پێش شۆڕشدا لەگەڵ ئێرانمان هەبووە. بێجگە لەمە وا دیارە کە ئاگاتان لە جمال عبد الناصر نیە، مەگەر نازانن ئەگەر بمانەوێ ئاڵوگۆڕێك لە سیاسەتی خۆمان لەگەڵ ئێران پێك بهێنین، چۆن دەکەوینە بەر هێرش و زەبر و زەنگی ئەو و خەڵکی عەرەب

که به راست یان غەڵەت وەداوی کەوتون. مـن بۆ خۆم ئێران و میللەتی ئێرانم خۆش ئەوێ، بـابم لـە کـوردە فەیلیەکانـە (کـوردی فـەیلی بـەو کـوردە شـیعانە ئەوترێ کە خەڵکی پشکوو پشتکۆی لۆرستـان و کرمانشان و ناوچـەکانی دیکـەی سەر سنورن کە باریان کردووە و چونەتە عێراق و خەریکی کەسابەتن. لـە پێش ئەوەیدا صدام حسین تکریتی تـەواوی ئێرانیـەکان دەربکـات، بـازاڕ و دوکـان و ئیشە سەرەکیەکانی ئـابووری هـەمووی بەدەست ئێرانیـەکان بـە تایبـەتی کـوردە فەیلیـەکان لـە عێراقدا بـوو)، بـابی دایکیشـم هـەر ئێرانی بـووە کـە وا بـو هیـچ هۆیەك نـابینم لـە بـەینی عێـراق و ئێراندا پـەیوەندی دۆسـتانە نـەبێت. بـە شـا ڕابگەیەنن پەلە نەکات، با گەرمای شۆڕش و هەرا هەرای ئەو خەڵکەی کـە دوای چەندین ساڵ ڕەنگی ئازادی و سەربەخۆییان بـە خـۆوە دیـوە هێـدی بێتـەوە، مـن بـەڵێن دەدەم لـە هـەوەلین کـاتدا دوای چارەسـەرکردنی گیروگرفتـەکانی نـاو وڵات بۆ ویستەکانی شا هەنگاو هەڵهێنمـەوە. بـە شـێوەیەکی تایبـەتی و ئاسایی داوا لـە گۆفارەکان ئەکەم کـە لەسـەرخۆ بـن و ڕێـز لـە وڵاتـانی خۆشەویسـتی دراوسـێمان بگرن. دوا بە دوای ئەم قسانە هەستا و بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی من بێـت تـا دەرگـای ژوورەکـەی لەگـەڵمان هـات و داوای لـە چاجوودانەکـەی کـرد تـا خـوارێ لەگەڵمان بێت و بەڕێمان بکات.

ئەمە نمونـەی شێوەکاری حیزبی بەعس بـوو کـە لـە شـۆڕش یـان بـا راسـتر بڵێـین کۆدێتاکـەی ١٩٥٨ دا، سـەرکردەکانی کۆدێتـا و حیزبـە سیاسـیەکانی دژ بـەرژێمی پاشایی و هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ( لە ناوچەی کوردستـانی عێراق لە جیاتی حیزبی دیموکـرات، وشـەی پـارتی دیموکـرات بـەکار هێنـدراوە، تـەنیا جیـاوازی دوو حـیزبی "دیموکراتـی ئـێران" و عێراقـە) و سـەرۆك عەشیرەکانی کورد و عەرەب هاوفیکرو یاریدەدەری یـەکتر بـوون. جا چ بکات بـە پـارتی دیموکراتـی کوردسـتانی عێـراق کـە چـەندین سـاڵە لە نزیکـەوە ئاگـاداری زوڵـم و زۆر و ئـاوارەیی و فـەرق و جیاوازیـەك کـە لەگـەڵ کوردەکـانی

نیشتەجێی ئێران، تورکیە، سوریە، عێراق و سۆڤیەت کراوە، جا بۆیە هەلیکیان بۆ رەخساوە کە تۆڵەی ڕابردوو بکەنەوە و هەرچی لە دڵیاندایە بیڵێن.
ئەم هەر هەمان پارتی دیموکراتە کە بە هۆی نەبونی سەرۆك بەلانی کەمەوە بیست ساڵ تێکۆشانی نهێنی هەبووە و دوای شۆڕشی ٥٨ دەستی کرد بە دەرهێنانی رۆژنامە و گۆڤاری وەك "خەبت" کە شای ئێران باسی کردبوو، کە بە بیرێکی تەسك و پێنوسێکی تیژ و تۆڵە ئەستێن هێرش دەکاتە سەر هەموو کەس. مێژووی تێکۆشانی سیاسی کوردەکان دوای دابەشکردنی ئیمپراتۆری عوسمانی لە شەڕی یەکەمی دنیاگر و لەت و پەت کردنی کوردستان کە لە هەزاران ساڵ لەمەو پێش پێکەوە و لە چوارچێوەی ئێراندا دەژیان و بە پێکهێنانی هەوەڵین حکومەت و دەوڵەتی ماد کە بوو بە سەرەتای دامەزراندنی رژێمی پاشایەتی لە ئێران و جگە لە هاوڕەگەزی هەرگیز لە هیچ کات و دەورانێکدا لە کوردێکی کورد زبان مەسەلەی جیابونەوە و نەبوونی هاوپەیوەندی نەبیسراوە. میللەتی کورد بەهۆی خۆشەویستی و عەلاقە بە ولاتی باب و باپیرانی ئێران لە میللەت و ولاتانی دیکە کە تێدا نیشتەجێن جگە لە بیرەوەری ناخۆش زوڵم و زۆر شتی دیکەیان لەوان نەدیوە.
شیکردنەوە و باسی تێکۆشانی سیاسی کوردەکان و پێوەندی پێنج دەوڵەت لەگەڵ ئەم میللەتە کەوناریە و نیشتمان پەرستی ئێرانی و شیکردنەوەی زوڵم و زۆر بێ عەدالەتییەکی کە لەوان کراوە لەم باسەدا جێ ناگرێ. لێرەدا تەنیا جێگایەك لەبەرچاو گیراوە ئەویش بۆ باسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق کە بەداخەوە ڕێبەرایەتیەکەی بە دەست مەلا مستەفا بارزانیە.
تێکۆشانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق - یش درێژەی تێکۆشانێکە کە دوای شەڕی یەکەمی دنیاگر و بەستنی پەیمانی سیڤەر (SEVERS) لە دەرەوەی پاریس کە سەربەخۆیی درایە کوردستان. کوردەکانیش شێخ محمودی حفیدیان بە ڕێبەری خۆیان هەڵبژارد کە خەڵکی سلێمانی و لە بنەماڵەیەکی

نەجیب و ئاسراوی سەییدەکانی بوو. بە دیتنەوەی نەوت لە ناوچەکانی موصل و کەرکوک، بە زەختی ئینگلیزەکان ئەم دوو شارە لە کوردستان جیا کرایەوە و باسی سەربەخۆیی کوردستانیش وەلا نرا. و لە پەیمانێکی دیکە کە لە جیاتی پەیمانی سیڤەر لە لۆزان بەسترا، لەبەر دڵی مستەفا کمال پاشا کە بە پشتیوانی هاوپەیمانانی ئینگلیز و فرنسا، کە تەواوی کەرەسەی جەنگ و ساز و بەرگی جەنگی فەرەنساویەکانی کە لە ناوچە جیاوازەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دایانابوو. بووە هۆی تێکشکانی یۆنانیەکان و لایەنگرانی خەلیفەی عوسمانی، و کوردستانی گەورەشیان لە نێوان پێنج وڵاتدا دابەش کرد کە بەشی هەرەزۆری کەوتە بەر تورکیەی تازە لەدایکبوو کە بووە جێنشینی ئیمپراتۆری تورکی عوسمانی. کوردەکان دە ملیۆن کەس بوون و وەنیشتمانەکەشیان بە ئەندازەی دوو وڵاتی سوریا و لوبنان بوو، کوردەکان هەر لە سەرەتای ئەم دابەش کردنەی نیشتمانەکەیان دەستیان کرد بە ڕاپەڕین و سەربزێوی کە مستەفا کمال پاشا بە هێزێکی ئەرتەش و بە پشتیوانی ڕۆژئاوا شۆڕشەکەیان لەسەر هەڵداندا، خنکاند و ژنراڵ ئیسحان نوری پاشا ڕێبەری نیزامی شۆڕشگێڕان پەنای بردە بەر ئێران و ناردیانە (یەزد). سەرکردە سیاسیەکانیش وەك شێخ سەعید و شێخ عبد القادر نهری و یارەکانیان لە سێدارە دران. مستەفا کەمالیش لەگەڵ عیسمەت ئینۆنۆ کە خۆی کوردە و خەڵکی ئاوایی ئینۆنۆیە لە مەڵبەندی دیار بکر بوو، هەروەها ئەنور پاشا کە لە سەرۆکەکان و شەڕکەری تورك بوو، حاشایان لە بوونی کورد کرد لە تورکیا و بە تورکی چیا ناویان بردن و هێشتاش هەر بەم ناوەیان ناو دەبەن. وێنەی ئەم ڕاپەڕینەش لە مەڵبەندی کوردستانی عێراق و لە شاری سلێمانیە بە ڕێبەرایەتی شێخ محمود حەفیدزادە ساز بوو. کە بە ناردنی هێزی ئینگلیزی و عێراقی و بۆمبا بارانی ناوچەکانی ناوبراو بە هۆی فرۆکەکانی ئینگلیزی ڕاپەڕینەکە سەرکوت کرا و شێخ محمود گیرا و بردرایە بەغدا و لەوێشەوە بۆ بەسرە وەتا دوا ئاخری ژیان لەو شارە دەست بەسەر

مایەوە و هەر لەوێش مرد. ئەم بێ بەزەیی و ئادادگەرییانە سەبارەت بە کورد بوو بە هۆی دامەزراندنی حیزبی سیاسی لە هەرێمەجیاجیاکانی کوردستان لە وڵاتە جیاجیاکاندا. هەروەکو دامەزراندنی حیزبی هیوا لە تورکیا و سازدانی حیزبی ئازادی کوردستان لە عێراق. جا ئەو پارتانە بە نهێنی دەستیان کرد بە تێکۆشان و ئەندامی زۆریان پەیدا کرد بەڵام ئەم وڵاتانەی کە بەرژەوەندییان لەو مەسەلەیەدا هەبوو لەگەڵ پارمەتیەکانی ئینگلیز و فەرەنسا بونە هۆی پەرە نەگرتنی ئەو پارتیانە و بەردەوامنەبونی تێکۆشانیان. تا شەڕی دووەمی دنیاگر دەست پێ کرا. ئینجا کوردەکانیش شان بەشانی نەتەوەکانی تر بۆ رزگاری لە زوڵم و زۆر و بندەستی وڵاتانی خاوەن بەرژەوەند کە تەواوی ناوچە و هۆز و نەتەوەکانی گرتبۆوە راپەڕین و دەستیان کرد بە رێکخستنی حیزب و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی و ئۆرگانی رەسمی حیزبەکانیان. لەوانە سازدانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە ئەزمونێکی زۆرەوە لە تێکۆشانی نهێنی خۆیدا [illegible] بوو. دەستی کرد بە تێکۆشانی بەرفراوان لە سەرتاسەری هەرێمی کوردستانی عێراق، وە بوە هۆی هاندانی کوردەکانی دانیشتوی وڵاتانی دیکە. (پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ئەمڕۆ بە ناوی جیاجیا چاپەمەنی جیاجیا کە بە ئۆرگانی ئەوان ناسراون کە لێرەدا جێی باسکردنیان نیە. گرنگ ئەمەیە ئەمە حیزبی سایسی کوردی عێراقییە کە پەیوەندییان لەگەڵ دەگیرێ و دەوڵەتی ئێران (ساواک) بۆ پاراستنی سوود و بەرژەوەندی خۆی بەرانبەر بە دەوڵەتی کودیتای ۱۹۵۸ کەڵکیان لێ وەردەگرێ. پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق دوای شەڕی دووەمی دنیاگر کە بە نهێنی و بۆ ماوەیەکی زۆر کورت بە ئاشکرا تێکۆشانی هەبووە خاوەنی بەرپرسانێك بووە کە هەرکامیان لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ناوبانگی باش و تێکۆشانی بەردەوام و کاریگەر و گیرو گرفت تەنانەت بەندیخانە و ئاستەنگی دیکەش کە حکومەتەکانی وەخت بۆیان پێك هێناون. نرخ وگرنگی ئەوان بۆ بەرێوەبردنی

ڕێکخراوێکی ئەوتۆ و دەستەی سیاسی بە تەواوی لەبار و مسۆگەرە، وەك پارێزەری عەدیلە تا ساڵی ١٩٥٣ سکرتێری گشتی بووە و بە لێهاتوویی تێکۆشانی نهێنی و بەربلاوی ئەو حیزبەی بەڕێوە بردووە و ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەگرتنی ڕێکخراوەیی و تێکۆشانی بەردەوام و شێلگیری لە هەموو ناوچەی کوردنشین لە زیندەیی بووە. لە ساڵی ١٩٥٣ دوای پێکهێنانی کۆنگرەی حیزب (ئیبراهیم ئەحمد) وەکیلی دادگوستەری و خەڵکی سلێمانی کە یەکێك لە مامۆستایانی ماف و حقوق و نووسەران و شاعیرانی بەناوبانگ و لە تێکۆشەران و لە پیاوە بەرچاوەکانی حیزب بووە. کراوەتە سکرتێری گشتی حیزب. لەم کاتەدا کە زۆربەی لاوانی خوێندەوار و تێکۆشەر و وەفادار بە نەتەوەی کورد لکان بە حیزبەوە و دەستیان کرد بە تێکۆشان لە سەرتاسەری کوردستانی عێراقدا کە لە سۆنگەی ئەوە ژمارەیەك لە ئەفسەران و غەیرە نیزامیانی کورد زمان بە هۆی دەوڵەتەوە گیران و لە بەندیخانە توند کران دوای دادگایەکی فەرمایشی لە زەمانی فەیسەلی دووەم و سەرۆك وەزیری ژەنراڵ نوری سعید گوللە باران کران.

لە کاتی بەدیهێنانی کۆماری کوردستان لە مهاباد هێندی لە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق[1] هاتنە مهاباد و دەستیان کرد بە خەبات و تێکۆشان بەڵام بە هەڵاتنی مەلا مستەفا لە عێراق و هاتنی بۆ مهاباد باری تاکە تاکی ئەندامانی حیزب شێوەیەکی دیکەی پەیدا کرد چونکە مەلا مستەفا حیزبی نەبوو، بە شێوەی عەشایەری و هۆزەواری و لەبەر پاراستن و ڕاگرتنی خۆی نەك بە ناوی پشتیوانی و پارێزگاری لە کۆماری کوردستان و بە تایبەت تێکۆشانی ئاشکراو نا ئاشکرای رووسەکان لە بەدیهێنانی ئەم کۆمارەو هەروەها شوێنەدانان و باڵ بەسەردا کێشان بەسەر ئەم کۆمارەدا تاکە تاکی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بەرە بەرە بە ناچاری خاکی ئێرانیان تەرك کرد و

---

[1] نووسەر لە هەواوە قسە دەکا. ئەو دەم پارتی دیموکرات تازە دامەزرا بوو، جگە لە یەك کەس هیچ یەك لە کوردەکانی ئێران نەچونە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.

چوونە کوردستانی خۆیان و لەوێ دەستیان کرد بە تێکۆشانی حیزبایەتی. دوای هاتنی ئەرتەشی ئێران بۆ شاری مەهاباد و هەڵاتنی هێندی لەبەر پرسان و کاربەدەستان لە مەهاباد بۆ مەڵبەندی جیاجیای عێراق لە تێکۆشانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا مانەوە و لەگەڵ هەندێ لە کوردەکانی کوردستانی ئێران پەیوەندیان دامەزراند.

عبدالرحمن قاسملۆ سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە لە ڤینا کوژرا، یەکێك لە تاکە تاکی حیزبی بوو کە بۆ ماوەی ساڵێك بە نهێنی لە مەهاباد دەژیا و تەنانەت جاروبار لە ماڵی قازی محمدی لەناوبراو بە وەسیەی ژنەکەی و خزم و کەس و کاری دەپارێزرا و رادەگیردرا تا توانی هەڵێ و لە ئێران دەرچوو. کە لە سەرەتاوە چووە عێراق و لەوێوە بۆ فەرەنسا و ئەوسا بۆ وڵاتانی رۆژهەڵات، خوێندنی تا پلەی دکتۆرا تەواو کرد. دوا تێکچوونی کۆماری کوردستان و هەر لە مەهاباد زۆربەی رۆڵەکانی کوردزمان چونە دەرەوەی وڵات، سەرەرای خوێندن و تێکۆشانی حیزبی، هێندێك لەوانە کەوتنە نێو داوی کۆمۆنیزمی نێونەتەوەیی، عبد الرحمن قاسملو بە پێچەوانەی ئەوەی دەگوترێ کە کۆمۆنیست بووە، یەك ئینسانی ناسیۆنالیستی ئێرانی و عەلاقەمەند بە هەڵسوڕانی خودموختاری یا خودیاری کوردستان و ئوستانەکان و هەرێمەکانی تری ئێران (حکومەتی ناوەندی بە وێنەی فیدراڵ) قاسملو هیچ کاتێك واژەیەك کە بۆنی جیابونەوەی لێ بێت بە زمانیدا نەهاتووە. لەبەر ئەوەی کە بتوانێ یەك ژینگەی دیموکراتیك یان حاکمیەتی خەڵك لەسەر خەڵك نە تەنیا بۆ کوردستان بەڵکو بۆ گشت مەڵبەند و نەتەوە و هۆزەکانی تری ئێران لە ژێر دروشمی سەربەخۆیی و گەورەیی بۆ ئێران خودموختاری یا بە نێویکی راستر حاکمیەتی خەڵك بەسەر خەڵکدا بۆ هەموو دانیشتوانی مەڵبەندی ئێران بۆ پێشخستنی ئامانجەکانی هیچ کاتێك وچانی نەدەدا و لەم رێگەیەشدا گیانی خۆی نایە سەری. رۆحی شاد بێ چەند جار لە لایەن دوژمنانیەوە هەروەها

دهسته و تاقمه دژهکانی کۆمۆنیستی ئێرانه، یان بیری کوردستانێکی سهربهخۆی ههیه. بهڵام بۆ ئهو کهسانهی که ئهومیان له نزیکهوه ئهناسی بۆیان روون ببۆوه، که ئهم قسانه تۆمهتێکی هیچ و پوچه و تهنیا له شتێك بیری دهکردهوه که ئهویش سهربهخۆیی و ئازادی ئێران و دامهزراندنی حکومهتێك به شێوهی فیدراڵ بۆ سهرتاسهری ئێران، بۆ حاکمیهت و بهشداری کردنی خهڵك له حکومهت کردندا، ههرگیز بیری بهلای کۆمهنیستی و تودهییدا نهدهچوو. ئهو له ماوهی شهڕ و کێشهی لهگهڵ کۆماری ئیسلامی که به هۆی کۆمهڵه و پارتی دیموکرات داسهپابوو، ههرگیز نهکهوتبۆوه بن شوێندانانی دهوڵهتی سهدام له عێراقدا. ئهوهی که قاسملو و ههڤاڵهکانی بیریان لێ دهکردهوه راستهخۆ ئهنجامیان دهدا. چهند جار داوای هاوکاری لهگهڵ موجاهیدینی خهڵك بههۆی سهدامهوه لێکرابوو، زهحتیشی کهوتبووه سهر که سهدام به زۆر موجاهیدینی خهڵك بنێرێته کوردستان تا لهوێوه بهرهنگاری هێزی ئێران بن قاسملو ههرگیز ملی بۆ ئهم کاره نا ئینسانیه رانهکێشا. ههرچهند زۆربهی دهوڵهتهکان و تاقمی له گروپه بهناو سیاسیهکان و .... هتد کوشتنی قاسملویان بهسهر کۆماری ئیسلامیدا بڕیوه. بهڵام به یهك لێکۆڵینهوهی وورد تێدهگهین که قاسملو به دهستی صدامی خوێنمژ و موجاهیدینی جهنایهتکار ئهنجام دراوه. داهاتویهك نزیك بێ لایهنه لهم بارهوه داوهری دهکا و ڕوو ڕهشیش بۆ درۆزنان دهمێنێتهوه.[1]

پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق به سکرتێری گشتی ئیبراهیم احمد که بۆ به ئاکام گهیاندنی شۆڕشی ۱۹۵۸ کۆشش و تێکۆشانی کردبوو، کهوته بیر که له

---

[1] دهبێ چ شتێك ئاغای پژمانی والێکردبێ که بکهوێته دیفاع له کۆماری ئیسلامی ئێران و له کوشتنی دکتۆر قاسملو که وهك رۆژ روناکه، پاکانه بۆ تیرۆریستهکانی کۆماری ئیسلامی بکا سهیر ئهوهیه مام جلال تاڵهبانیش له ههوهڵین دهربڕینیدا سهبارهت به شههید بوونی دوکتۆر قاسملو کوشتنی دکتۆر قاسملوی بهسهر حکومهتی عێراقدا هێنا.

کەسایەتیەکی ئەوتۆ کەڵك وەرگرێ کە لە چەوسانەوەی خەڵك بەرگری کردبێ و بۆ پەرەدانی ڕێکخراوە و زیاتر تێکۆشانی حیزب و بۆ دابین کردنی ئەم بیر و بۆچوونە کۆنگرەی حیزبی بەدی هێناو بە پێشنیاری سکرتێری گشتی، بەتێکڕای دەنگ مەلا مستەفا کە هێشتا لە شۆرەوی بوو، بە سەرۆکایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق هەڵبژێردرا. ئەم هەڵبژاردنە بەو مانایە نەبوو کە برایم احمد یان بەرپرسانی باڵای حیزب مەلا مستەفایان بە چاکی دەناسی و بە بیرو پێشینەی ئەو ناسیاو نەبوون، بە پێچەوانەوە هەموو ئەوانە کە لە دواییدا لەگەڵ تاکە تاکیان رووبەرو بوم قسە و پەیڤینم لەگەڵ کردبوون، مەلا مستەفایان بە پیاوێکی خۆویست ئەناسی، کە لایان وابوو سەرەڕۆ، عەشایر مەسلەك، نەخوێندەوار، قانزانج ویست و هەل پەرست کە زۆر نەرمە و زۆر شوێنی لەسەر دادەنرێت، بەلأم لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا زۆر زوڵم و زۆری دیبوو لەگەڵ دەوڵەتەکانی پێشووی عێراق شەڕ و لێکدانی دیبوو، و بۆ دابینکردنی سودی کەسایەتی خۆی یان بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی ئینگلیزەکان و بە پێی ڕوانگەی داخوازی ئەوان کەلە ساڵانی ڕابردووەوە لە تەمەنی لاوی و لەو رۆژگارەی کە سەر کرێکار بووە لە مەڵبەندی هەولێردا لەگەڵ کاربەدەستانی ئەوان بۆ وێنە لەگەڵ سەرهەنگ ئیدمۆنس هاوکاری هەبووە، خۆشەویستییەکی بە درۆ بۆ ئەو لە نێو چینی بێ ئاگا هەرەمەی خەڵکی کوردستانی عێراق بەدی هاتبوو.

زیاد لەوەش دەوڵەتی کودیتا و خودی عبد الکریم قاسم بە ڕواڵەت خۆی بە چەپ و دۆستی سۆڤیەت نیشان ئەدا لەم ڕوانگەیەوە وایان بیر دەکردەوە کە مەلا مستەفا لەو هەل و مەرجەدا دەتوانێ بۆ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە کەڵك بێ کۆری هەڵبژێردراوی پارتی دیموکرات بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم احمد سکرتێری گشتی حیزب لەگەڵ ژەنراڵ عبد الکریم قاسم سەرۆك وەزیر دیاری کرد، و داوای لێ کرد کە دەستور بدا مەلا مستەفا و هاورێکانی کە

تا پێنج سەد کەس دەبن لە سۆڤیەت بگەڕێنەوە، عبد الکریم قاسم ویستەکەی ئەوی قبوڵ کرد، هەر خێرا ج بە هۆی وەزارەتی دەرەوە و بە هۆی خۆنیشاندانێکی تاکە تاکی حیزبی لەبەر دەم باڵوێزخانەی سۆڤییەت لە بەغدا گەڕانەوەی مەلا مستەفایان لەوێ داوا کرد. کاروانی مەلا مستەفا لە سۆڤیەت کەوتە ڕێ[1]، و هاتە بەندەری ئیسکەندەریە لە میسردا. دوای چاوپێکەوتن و وتووێژ لەگەڵ جمال عبد الناصر ڕێبەری میسر هاتەوە عێراق و لە بەندەری بەسرە هەزاران کەس لە کورد و عەرەب چونە پێشوازی، وە زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە هێنایانە وەزارەتی بەرگری و دیداری سەرۆک وەزیرانی کرد. ئەوسا چووە کۆشکی فەیسەڵ لە ناوبراوی کوڕی گەورەی ژەنەراڵ نوری سعید دووایین سەرۆک وەزیر و وەزیری بەرگری ڕژێمی پاشایەتی کە لە فڕۆکەوانانی شیاو و ناوداری هێزی هەوایی عێراق بوو، کە ئەو ماڵەیان بۆ مەلا مستەفا لە پێش چاو گرتبوو. و لەوێدا نیشتەجێبوو کورد، فارس، عەرەب، عەجەم، شیعە و سوننی و سەرەنجام لە هەر چینێك خەڵك دەچوونە دیداری بارزانی و گەڕانەوەی ئەویان پیرۆزبایی دەگوت، سەرانی هۆزەواری باکوری عێراق و تاکە تاکی ناوداری هەرێمەکانی تر دەهاتنە بەغدا و دەچوونە دیداری بارزانی، بێجگە لە محمود ئاغای زێباری سەرۆك هۆزی زێبار کە لە زووەوە رقی لێی بوو، و دوژمنی بوو، و لە ڕاستیدا سەرۆك هۆزێك بوو کە مەلا مستەفا و بارزانییەکان لە ڕابردووەوە بەبەشێ لەو هۆزە دەهاتنە ژمارە، دوای دیدار و هاتوچۆ بۆ لای بارزانی لە کۆڕێکی گەورەدا کە لە ژمارەیەکی زۆر حیزبی و غەیرە حیزبی لە یەکێك ستادیۆمەکانی وەرزشی بەغدا پێکهاتبوو، برایم احمد سکرتێری گشتی حیزب دوای بەیانکردنی تێکۆشانەکان و ملە بە ملانێیەکانی بێ وچانی مەلا مستەفا لە

---

[1] بە پێچەوانە مەلا مستەفا خۆی بە تێلگراف داوای گەڕانەوەی لە عبد الکریم قاسم کرد و چووە چیکۆسلۆفاکیای پێشوو لەوێوە بەرەو میسر و کوردستان گەڕایەوە. نەچووە بەندەری بەسرەو بە فڕۆکە لە قاهیرەوە ڕاست هاتەوە بەغدا.

ڕێگای کورد و کوردستاندا، لیبرانی کۆمیتەی ناوەندی بۆ هەڵبژاردنی مەلا مستەفا بۆ سەرۆکایەتی حیزب ڕاگەیاند. خەڵکەکە دەستیان کرد بە شادی و پلە زیقان و چەپڵە ڕێزان و خۆشی لەو ستادیۆمەدا. مەلا مستەفاش بە پێی خەسلەتی خووی هەمیشەیی خۆی بێ چکۆلەترین هەستێك یان دەربڕینی واژەیەك سوپاس بۆ ڕێزدانان لە حازران لە کۆڕەکە چووە دەرێ.

بۆ ماوەیەکی کەم بە بۆنەی بەرنامەی جەژنی قوربان یان ڕەمەزان چووە باکووری عێراق، پێشوازی و بەڕێ کردنی ئەو لە شارەکانی سەر ڕێگا تا گەیشتن بە بارزان بێ وێنە بوو، مەلا بۆ لابردنی دوژمنایەتی دێرینە، کچی محمود ئاغای زێباری وەك سێیەمین ژنی لەخۆی مارە کرد. لەم ژنە چەند زارۆکی بووە، یەك لەوان مسعود بارزانییە کە چکۆلەترین منالی بارزانییە، مسعود بارزانی ئێستا ڕابەرایەتی بەشێ لە پارتی دیموکرات کوسدتانی عێراقی بەدەستە[1] و لە سەرەتای شەڕ لە نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی و هەروەها شەڕی ئێران و عێراق لەگەڵ کۆماری ئیسلامی هاوکاری دەکا و پێشمەرگەکانی ئەو توانیویانە لە مەڵبەندی جیاجیای باکوری عێراق سەر بکەن و سەرکەوتنێك وەدەست بهێنن.

ئەم سێ کوڕەی مەلا مستەفا ، لوقمان، ئیدریس و مسعود لەوانی دیکە بەناوبانگترن بە پێچەوانەی باوکیان خوێندەواریان هەیە و تا ئەو شوێنەی لوقمان بۆ وەزیری ڕاوێژکار سەدام هەڵبژێردرا. ناوبراو بە تۆمەتی بێجێ کە لە تەك تاکە تاکی هەندەران پێوەندی هەیە گیراو لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا لەدار درا. ئیدریس بارزانیش دوو سێ ساڵ لەمەو بەر بە ڕاوەستانی دڵ مرد. ئەمڕۆ تەنیا مسعود بارزانیە کە جێنشینی باوکیەتی و خەریکی تێکۆشانە کە دوای ئاگر بەس لە ١٩٧٥ لە نێوان کورد و دەوڵەتی عێراقدا هاتۆتە ئێران و زۆربەی تاکە تاکی

---

[1] نووسەر هە لەسەر بیری کۆن دەڕوا، ئێستا پارتی نەك دووبەش نیە بەڵکو یەکگرتوشی لێ زیاد کراوە و مسعود سەرۆکی پارتیە.

پێوەندیدار لەگەڵ ئەو بارزانی و کەس و کار و هۆزەکەیەتی، کە نەخوێندەوارن و لە ڕێکخراوە و تەشکیلاتی حیزبیدا زۆربەیان بێ ئاگان. ووریا و لێهاتوو خوێندەوار پتر لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان کۆ بونەتەوە، بە ڕێبەرایەتی جەلال تاڵەبانی، ئەم جیزبەش خۆی بە جیا لەسەرەتای شەڕی ئێران و عێراقدا لەگەڵ کۆماری ئیسلامی هاوکاری کردووە.

گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ عێراق و چوونی ئەو بۆ باکور و مەڵبەندی جیاجیای کوردستانی عێراق شوێنێکی زۆری کردە سەر بیرو باوەڕی کوردەکانی ئێران و کوردەکانی دانیشتوی، تورکیە و روسیە و سوریە هەروەها شوێنی لەسەر چینەکانی جیاجیای ئەو کوردانە دانا کە لە وڵاتە ئەوروپاییەکان خەریکی خوێندن یان کەسب و کار بوون. ئەم شوێن دانانە لەو پڕوپاگاندەیە سەرچاوەی دەگرت کە حیزب بە سکرتێری گشتی برایم احمد بۆ بەهێز کردن و پەرەپێدانی حیزب ئەنجام ئەدرا. نەك کەسایەتی تێکۆشانی مەلا مستەفا چونکە ئەو لە بنەڕتا باوەڕ و بڕوای بە حیزب و تەشکیلات و سازدانی حیزبی نەبوو، نەخوێندەواری هەبوو نە وەزەو بەڕێوەبردنی حیزبی هەبوو.

پێبەپێی حیزبەکانی دیکەی دیموکرات لە وڵاتەکانی تر، تاکەتاکی ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕێکخراوەی خۆیدا ئاڵ و گۆڕێکیان بەدی هێنابوو، رۆژ بە رۆژ ئەندامان و ئۆرگانی حیزبی زیاد دەبوون. جا لەبەر ئەمە بە ڕێکخراوەی ئاگاداری (جاسوس)ی هەرێمەکانی رۆژئاوای وڵات دەستوری شێلگێر دوابوو کە وشیاری تێکۆشانی نهێنی کوردەکان بن. بۆ بەدیهێنانی ترس و مەترسی لە هەرێمدا و هەروەها بۆ بەرگری و لەناوبردنی هەرچەشنە شوێنەوارێکی تێکۆشانی حیزبی دیموکرات، ئیدارەی گشتی ئەمنیەتی ناوخۆی (ساواك) بۆ گرتن و بەند کردنی ژمارەیەکی زۆر نزیکەی دووسەد، سێسەد کەس لە هەموو ناوچەکان دەست بەکار بوو تۆمەتی ئەوانەش ئەندامەتی یا ئۆگرداری لە حیزبی نا قانونی تودە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا هۆی گرتنی ئەوان

تێکۆشان لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا بوو، کە دوای ماوەیەکی کورت بەو هەموو هەڵاو بگرە کە لە ناوەوە پەیدا ببوو، زۆر بەی گیراوەکان بێ تاوان بوون و ئازاد کران.[1] ئەم گیران و بەند کردنە لە مەڵبەندەکانی پاکوری عێراق و بەغدا و ناوەندی تێکۆشانی کوردەکان لە ئەوروپا دەنگی دایەوە و چاپەمەنی جیاجیای کورد، عەرەب و باقی زمانەکانی هەندەران بە دژی شای ئێران و ساواک دەستیان کرد بە هێرش و تەنانەت لە رادیۆکانی وڵاتانی رۆژهەڵاتیشدا هاودەردی و هاودەنگی خۆیان نیشان ئەدا.

من لە هەر بابەتێکەوە ئامادەییم پەیدا کرد کە سەرەڕای ئەنجامی ئەرك و سپاردە لە جێی ماموریەتی خۆمدا، سەفەر بکەم بۆ کوردستانی عێراق، تورکیە، سوریە و لوبنان ( لە لوبنان مەڵبەندێکی تایبەت بە ناوی کوردستان یا تێکۆشانێکی بەرچاو لە هیچ سەردەمێکدا نەبووە، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە کوردی تورکیە و سوریە لە بیروت و شارەکانی یدکەی لوبنان نیشتەجێن) هەروەها لە وڵاتانی ئەوروپاییدا کە زۆر لە کوردەکان بۆ خوێندن یان کار کردن لەوێ دەژین، بڕۆم و لە نزیکەوە لەگەڵ زۆربەی سەرۆك هۆزەکان و پیاوە گەورە و بە نفوزەکانی کورد ناسیاو بم و قسەیان لەگەڵدا بکەم. لە باری ژیان و تێکۆشانی ئەوان بە گشتی ئاگادار بم پێ بە پێی ئەم تێکۆشانە ئەوەی کە گونجا بوو پێشتر لە بارەی عێراقەوە موتاڵا و لێکۆڵینەوەم هەبوو بە ناوی جیاواز و لە ڕێگای ئاشکرا و نهێنیدا چوبومە عێراق، و لە نزیکەوە لە باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ... هتد. ناسیاویم پەیدا کردبوو. دەیهێنمەوە بیر کە جارێکیان بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەت چەند مەبەستێکەوە چووبوومە پاوە و نەوسود لای هەورامانی لهۆن کە بەشێکە لە کرماشان، بە لێکۆڵینەوەیەك لەگەڵ تاکە تاکی خەڵکی ئاگاداری ئەوێ. بێ ئاگاداری مەرکەز و تەنانەت بێ ئاگاداری سنورەوانی

[1] نووسەر باسی ئەو ئازار و ئەشکەنجەیە ناکا کە ئەم گیراوانە لە گرتوخانەی ساواك توشی هاتن و لە سێ ساڵەوە تا ئەبەد هەمویان لە دادگای قوڵابیدا مەحکوم کران.

نوسود سەرهەنگی سوار ئاشووری کە چووبومە ماڵی ئەوان، بەشەو لەگەڵ یەك نەفەر ناسیاو چاوساغ بە جلی کوردیەوە لە سنوور پەڕیمەوە و لەماوەی رۆژێکدا خۆم گەیاندە سولەیمانی. لە سولەیمانیەوە بەهۆی تێکۆشانی سەختی حیزبی کەلە هەموو بارێکەوە لەژێر چاودێری حکومەتدا بوو چوومە ماڵی یەکێك لە ناسیاوەکانم کە بۆ هەوەلین جار منی دیبوو، بە ناو دەیناسیم بۆ رۆژی دوایی بە ناوی یەکێك لەوانەی کە کاری هەبوو چومە سەر کۆنسولگەی ئێران و نوێنەری ساواك، محمد رحیم زادە کە لە ژێر نێوو ئیشی یارمەتیدەری کۆنسولگەری کاری دەکرد و لە باری کاری ئاگادرییەوە (ئیتلاعاتی) کارمەندی من بوو هەر کە دەرگاکەم کردەوە چاوی بە من کەوت هەستا ووتی چ کارت هەیە !؟ منیش خێرا پینج کلاوی کورد و چاویلکەیەکم دانا، لەبەر سەرسوڕمان توانای قسەکردنی نەبوو، نەیدەتوانی باوەڕ بکا کە بەو جۆرە توانیبێتم بێمە سەرکۆنسولگەری، دوای وتووێژێکی کورت لەگەڵ ئەودا چوومە ماڵی خانەخۆیەکەم و لەوێشەوە گەڕامەوە ئێران، لەو سەفەرەدا لە رێگا لە بیارە کە رووبەری نەسوودە چوومە دیداری شێخ عوسمانی نەقشبەندی رێبەری فرقەی نەقشبەندی کە لە زۆربەی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست مریدی هەیە، ناسیاویم پەیدا کرد. هەر ئەم ناسیاویە بوە هۆی ئەوەی کە بەئاسانی رێی بۆ بکەمەوە تا ئەو و بنەماڵەکەی پەنا بێننە بەر ئێران، و تا شۆڕشی ١٩٥٧ لە ئێراندا مانەوە و ئێستا لە بەغدان.

دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ تاران منیان خستە ژێر پرسیار و پێیان ووتم لەوە دوا بێ ئیزن لە ولات دەرنەچم. لە سەفەرێکی دیکەدا بۆ باکوری عێراق بە ناوی ساختە و کاری مامۆستای مێژوو و جوغرافیا کە بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەت مێژوو و جوغرافیای باکوری عێراقەوە چووبوومە ئەوێ، لە کەرکوك و دادگوستەری ئەو شارە توانیم لەگەڵ برایم احمد سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق دیدار و وتووێژ بکەم کە بە هۆی تێکۆشانی سیاسی سەخت

له سولەیمانییەوە شار بەدەر کرا بوو بۆ کەرکوك و لەوێ خەریکی وەکالەت بوو. وێنەی ئەم جۆرە سەفەر و ماموریەتانەم بۆ وڵاتانی تر کردووە و ئاگاداری بەکەڵك و سەرنج راکێش و سەیر و سەمەرەم لە بارەی کوردستان و کوردەکانی نیشتەجێی ئەو وڵاتانە بەدەست هێناوە، کە هەر کام بۆخۆی بوون بە باشترین مایە و سەرمایەن بۆ ئەنجام دانی ئەرکی دوایم.

مەسەلەیەکی سەرنج راکێش کە هێشتا نهێنیە و لە کاتی سەرۆکایەتی سپهبۆد بەختیار قسەی لێکراو بەرێوەبرا، بەدی هێنان و چاپکردنی رۆژنامەیەك بوو بە زمانی کوردی کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئێراند لە تاران بەهۆی ساواکەوە لە چاپ ئەدرا و بلاو ئەکرایەوە، ئەم مەبەستە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ کە کاتێ لەگەڵ دکتۆر کامەران بەدرخان مامۆستای کورسی زمانی کوردی لە زانکۆی سۆربۆن لە پاریس دانیشتم دەوڵەتی ئێرانی سەبارەت بە پێشگری لە تێکۆشانی فەرهەنگی کوردەکان کە لە هەر شوێنێکا نیشتەجێن لە تەك ناسیۆنالیزمی ئێراندا پێوەندی هەیە و شانازی پێوە دەکەن، زۆر جار دەگیرێن و ئازار و ئەشکەنجە دەدرێن. دکتۆر کامەران بەدرخان لەم بابەتەوە دەوڵەتی ئێرانی سەرزەنشت کردو داوای لە من کرد بۆ نیشان دانی دڵپاکی دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە کورد ئیجازە بدرێ تا رۆژنامەیەك بە زمانی کوردی چاپ و بلاو بکرێتەوە و چوار کوردیش کە لە دادگای نیزامی مەحکوم بە مەرگ کراون، لە لایەن شاوە ببەخشرێن و لە زیندان ئازاد بکرێن. کاتێك گەرامەوە تاران قسەکانم بۆ سەرهەنگ دکتۆر پاشای سەرۆکی خۆم گێرایەوە ئەویش پێی خۆش بوو، و قسەکانی منی بو گوزارشت نارده لای کاربەدەستانی سەرتری ساواك و خۆشی بە شوێنیان کەوت تا بەڵێنی وەرگرت کە سپهبۆد بەختیار بە شای رابگەیەنێ، و بەو جۆرە ئەو چوار کوردە لە مردن رزگار کران. من لەبەر ئەم کارە کە کردبووم کەوتمە بەر تانە و تەشەری بەرپرسانی ساواك تەنانەت یەکێك لەوانەی گوتبووی بە داخەوە ناتوانم دەنا سەرگورد پژمان- م لەباتی ئەو

چوار کەسە دەکوشتن. هەواڵی بەخشینی ئەوانەم بە دکتۆر کامەران بەدرخان و بەرپرسانی ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس کە هێشتا هەر ماوە و کاری فەرهەنگی و سیاسی کورد دەکا راگەیاند ئەم خەبەرە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەری فەرەنسا و لوبنان دەنگی دایەوە کەئەو ڕۆژنامانە دەیانتوانی لەم بار و بابەتەوە شت بنووسن.

لە تاران ڕۆژنامەیەك بە ناوی "کوردستان" بە بەرپرسی و سەرپەرشتی خوالێخۆشبوو بەدیعالزمان بە کورد زمان و یەکێ لە زانایانی بەناوبانگی کوردستان و مامۆستای زانکۆی تاران بوو، هەروەها بە هاوکاری دڵسۆزانەی هەندێ لە نووسەرانی کورد بۆ وێنە خوالێخۆشبوو دکتۆر محمد صدیق مفتی زادە و بە پا رە و پشتیوانی ساواك چاپ و بڵاو دەکرایەوە. ئەم ڕۆژنامەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کە کوردی تێدا بوو بەڕێ دەکرا. مەبەستەکانی ئەو ڕۆژنامەیە ئەوەندە جیاجیاو سەرنج راکێش بوو کە هەر ژمارەیەکی لە عێراق بە دینارێك (٢٠) تمەنی ئەو کات دەکڕدرا. بۆ پشتگیری کردن لە چاو راو دنەدانی کوردەکانی عێراقی و کوردەکانی دانیشتوی ئەوروپا دژی دەوڵەتی ئێران سەبارەت بەرەفتاری حکومەت لەگەڵ کوردەکان، پازدە دەقیقە بەرنامەی کوردی لە رادیۆی تاران بڵاو دەکراوە کە دوایی بوبە سەعاتێك و لە شارەکانی مهاباد و رەزاییە (ورمێ) و سنە و مەشهەدیش بەرنامەی کوردی رادیۆیی دامەزرا.

دوای دامەزرانلنی تەلەفیزیۆن لە ئێران، بەرنامەی هونەری، شایی و هەڵپەرکێ و ساز و ئاواز و گۆرانی کوردی هەفتەی جارێك بۆ ماوەی سەعاتێك بەڕێوە دەبرا. ئەم جۆرە کارانە شوێنێکی زۆر باشی دانا لە مەڵبەندەکانی جیاجیای کوردستانی ئێران و وڵاتەکانی تر کە کوردیان هەیە. ئەم کارە لە تینوێتی و چاو و ڕا و هاندانی کوردەکان دژ بە دەوڵەتی ئێران کەم کردەوە. هەروەها بوبە هۆی ئەوە کە من بتوانم لە دیداری خۆم لەگەڵ کوردەکانی عێراقی دڵپاکی دەوڵەتی ئێران لە بابەت کوردەکانەوە ڕا بگەیەنم و لەهەر بابەتێکەوە هێندێك

لەم کارانە کە لە ئێران دەکرێ ببیدەم بە چاویاندا. تا ئەو جێیەی دەگونجا، لە دیدار و وتووێژ لەگەڵ رابەرانی کوردی عێراق یان کەسانی دیکە کە لە دواییدا ئەیانتوانی بۆ ئەنجام دانی کارەکانم بەکار بێن، دریغیم نەدەکرد و رۆژ بە رۆژ پەرەم بەو دیدارانە ئەدا. رۆژێك بانگیان کردمەوە بۆ تاران و لەوێ لە تەك سەرۆکی خۆم دیدارم کرد، مەبەستێکی زۆر گرنگی هێنا گۆرێ، کەئەگەر بە کردەوە بکرابایە، دەبو بە یەکێك لەشاکارە گرنگەکانی ساواك لە دەرەوەی وڵات، سەرۆك وتی: دوای لێکۆڵینەوەیەکی بەرپێوە چووە جگە لە چاودێریەکی کە ئیدارەی ئەمنیەتی خۆجێیی ساواك لە بارەی کوردستانەوە دەیکا و ئەم هەنگاوانەی لە بواری جیاوازی کلتوری و تەبلیغاتییەوە بۆ راکێشانی خۆشەویستی و هۆگری و هەروەها پێوەندی کوردەکان بە گشتی لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ئێران کراوە، بەس نەبوون ئەوەی لە توانا و دەرەتاندا هەبێ دریژەی پێ دەدرێ بەلام دام و دەزگای عبد الکریم قاسم و باقی پارتە سیاسیەکان چ کورد و چ عەجەم و عەرەب لەو وڵاتەدا باوەڕیی ئەوتۆیان بە ئێران نییە، هەرچەند ئەگەر باوەڕێشیان هەبێ لە ترسی جمال عبدالناصر ناتوانن تەنانەت بە رواڵەتیش شتی وا بکەن. ساواك بەپێی کەلاڵەیەك کە ئامادەی کردووە و پەسەند کراوە دەیەوێ کە هۆ و کەرەستەی رووخانی دەوڵەتی عبد الکریم قاسم ئامادە بکات و بۆ گێرانەوەی رژێمی پاشایەتی لە عێراق ئەوپەری تەقەلا و تێکۆشان بەکار بێنێ ئەنجام دانی ئەو کارەی بە تۆ سپاردووە، کە زۆر بە ووردی لێی بکۆڵییەوە و راپەڕاندنی ئامادە بکەی، دوای پەسەند کردن ئەنجامی بدەی منیش کە سەرم لەو کارانە دەخورا ئامادەیی خۆم راگەیاند بەو مەرجەی کە پیاوی وریا و ئاگادار و بە نفوز چ لە عێراق یان دەرەوەی عێراقدا لە ئیختیارم بنێن. ئەوانیش وتیان لەو بابەتانەوە هیچ جێگای نیگەرانی نیە، سپهبۆد بەختیار و دۆستانی کە لەگەڵ کەسانی ناسراو و جێگای بڕوای عێراق دۆستایەتی و ناسیاریان هەیە لەو رۆژانەدا لەگەڵ یەکێك

دەتکەنە ناسیاو تا کەڵکی لێ وەربگری. دوای چەند ڕۆژ لە ماڵێکی نهێنیدا لەگەڵ پیاوێك بە ناوی رشید کلیدار کە عێراقی و شیعە و برای شێخ علی کلیداری - ی کاظمەین بوو بووم بە ئاشنا هەرچەند بەرواڵەت وای نیشان ئەدا کە یەکێ لە خاوەن پلەو پایەکانی رژێمی رابردووی عێراق بێ، بەڵام وا نەبوو ئەو تەنیا کارێکی گرنگ کە دەیتوانی ئەنجامی بدا دۆستی و ناسیاوی لەتەك سیاسی و گەڕێنەرانی دەوڵەتی پێشووی عێراقدا بوو، ئەو دۆست و ناسیاوی زۆری هەبوون کە دوای شۆڕشی ١٩٥٨ لە ترسان رایان کردبوو لە هەندەران نیشتەجێ ببون هەروەها لە عێراقیشدا لە نێو چینە جیاوازەکانی خەڵکدا دۆستانێکی هەبوو کە دوای شۆڕش کاری گرنگیان لە دەوڵەتی کودیتا بەدەستەوە بوو، کارکردن لەگەڵ ئەو بۆ ئامادەکردنی بیوگرافی کەسایەتی جیا جیا لە نێو گشت چینەکانی رژێمی بەر لە کودیتا و دوای کودیتا کە ئاگادارییەکی باش هەبوو، سەرنج راکێش و بەکەڵك بوو، ناونیشانی زۆربەی ئەوانەی ئەزانی کەلە دەرەوەی عێراقدا بوون، و جۆرێکی نیشان ئەدا کە زۆر بە ئاسانی بتوانم لەگەڵ هەر یەك لەوانە دیدار بکەم و بیانبینم، و تەشکیلاتێك لە هەندەران بەهۆی ئەوان لە دەرەوەی وڵات یان لە نێو عێراقدا ساز بدەین دیارە من بۆ کار قایمی خۆم وام پێ باش بوو کە تاکی تاکی ئەوانە کە دەیانەوێ لەگەڵ ئێمە کار بکەن ببینم و بارو دۆخی ئەوان لە تێکۆشانی نهێنی و لەم مەسەلە گرنگەدا هەڵسەنگێنم چومە بیروت و لەوێ چاوم بە چەند کەس لە پیاوە گەورەکانی رژێمی پێشوو کەوت وەك بنەماڵەی چەلەبی هەندێ لە ڕابەرانی گەورەپیاوانی کورد کە دوای کودیتا بە ناچار چوبونە بیروت، نەتیجەی کارەکانم بە مەرکەز راگەیاند و هیوام دەربڕی تا بەڵکو بتوانم ئەم تەشکیلاتانە ج لە ناوەوە ج لە دەرەوەی عێراق پێکەوە پێوەند بدەم و لە کات و ساتی دیاری کراودا نەخشە و گەڵاڵەی ڕووخاندنی رژێمی بەغدا بە هۆی ئەوانەوە بە ئەنجام بگەیەنم. من نیازم نەبوو لە پایە و پلەیەکدا نەبووم تا بزانم شای ئێران ئەو مەسەلەیەی

لەگەڵ کێ و چ کەسایەتی‌یەکی بێگانە یا دەوڵەتی بێگانە هێناوەتە گۆڕێ، ئەگەر بشم ویستبا نەمدەتوانی مافی ئەوە بە خۆم بدەم و ئاگاداری بم، بەڵام سەرۆکی خۆم و چەند کەس لەو سەرتریش ئەوەندەیان بڕوا بە من بوو کە هیچیان لە من نەدەشاردەوە مەگەر شتێك کە پێویست نەبوایە کە من بیزانم لەو رووەوە بێجگە لە دەوڵەتی ئوردونی هاشمی و خودی مەلیك حسین و لە سەرچاوە و کەسایەتی دەوڵەتانی تری بێگانە ئاگاداریم نەبوو، و لەم بابەتەوە شتێکیان بە من نەگوت منیش نەمپرسی. من ئەرکی خۆن ئەنجام ئەدا و بە کاری خۆشم بڕوام هەبوو کە دەبێ ئەو ئەرکەی بە من سپێردراوە دەبێ لەکات و ساتی خۆیدا ئەنجامی بدەم. لەوانەیە خوێنەران وا بیر بکەنەوە کە رووخاندنی رژێمی عبد الکریم قاسم و گەڕانەوەی رژێمی پاشایەتی چ پەیوەندی‌یەکی لەگەڵ بەستنی قەراردادی ۱۹۷۵ ی ئەلجەزائیردا هەیە؟ بەڵام ئەوانە وەك زنجیر پێکەوە گرێ دراون و هەریەکە لەوان تەواوکەرەوەی ئەوی دیکەیە، جا ئەگەر یەکێ لەوانە لە قەڵەم بکەوێ خوێنەر جوان بۆی ناچێتەوە سەر یەك. دەبێ عەرەبی سوونی و قەومی لەگەڵ عەرەبی شیعەی بەعسی و هەردوکیان لەگەڵ کوردی بە رەگەز ئێرانی دانیشتوی عێراق پێکەوە نزیك بکرێن و چاویان بە یەك بکەوێ تا بگەنە یەکتری و هەمویان پێکەوە بۆ یەك ئامانج تێبکۆشن، تا ئەو کوردانەی کە بۆ دابین کردنی بیرو ڕا و ویستی دەوڵەتی ئێران لەبەر چاو گیراون بزانن و بفامن کەلە تەك چ دەوڵەت و چ هێزێکدا کار ئەدەن. ئەگەر لە کورد لە ڕێبازی ئامانجیدا کەڵك وەرنەگیرێ، هاوکاری نەکا، یا ئەگەر هاوکاریش بکا، رواڵەتی‌یە، باوەڕ و بڕوای نەبە کار دەبێ و نەبە کاردار[1].

من هەمیشە بۆ ئەنجام دانی کاروباری پێ ئەسپێردراو لەزم کردووە و خۆم بە ئاو و ئاگردا داوە، ئەوانەی دەمناسن و هەر ئێستاش زیندوون باوەڕیان بە

---

[1] بە کوردی و کورتی دەبێ بزانێ کورد چۆن فریو دەدرێ و کڵاوی لەسەر دەنرێ، تا بتوانێ بە قازانجی خۆی کەڵکی لێ وەرگرێ.و.

قسەکانم هەیە. جا هەر لەبەر زوو ئەنجام دانی کار و بەرپرسی خۆم بێ هیچ سێ و دوویەك لەگەڵ بەرپرسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە بەغدا دیدارم کرد کە بە بنەچەکە ئێرانی و لە خوێندەواران و خەڵکی مهاباد بوون کە دوای روخانی کۆماری کوردستان هەڵ هاتبوو بۆ وڵاتە عەرەبییەکان و لەو سەردەمەیدا لە بەغدا دەژیا. هەر کە چاوم پێ کەوت ناسیمەوە، بەڵام چەند ساڵ لەمەو پێش، کە لەیەکێ لە ئوتێلەکانی دیمەشقدا چاومان بە یەك کەوتبوو، بە ناوی خواستنەوە خۆمان بەیەك ناساندبوو لە پاشان دوای وورد بونەوە زانیم ئەو کەسەم لە سوریە دیوە کە ئێستا بەرپرسە و لە بەغدایە (عیسا زەبیحی)یە، چونکە هەردوکمان بە نێوی ئەسلی یەکتر ناسیاو ببوین، برِوای زیاترمان بە یەکتر پەیدا کرد، ئیتر قەرارماندا وەخت و بێ وەخت لە کاتی پێویستدا چاومان بە یەکتر بکەوێ، هەروەها بیرو ڕا و سیاسەتی موافیقی دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە کورد و ئەو ئەرکانەی کە لە بابەت فەرهەنگی و ئەدەبی و پروپاگەندەوە ئەنجام درا بوو، بۆم شی کردەوە و داوام لێ کرد کە ئەمانە بە ڕابەرانی پارتی و کەسانێ وەك برایم احمد، سکرتێری گشتی، جەلال تالەبانی، عمر دەبابە، همزە عبد الله و سەرئەنجام بە مەلا مستەفای را بگەیەنێ، جا ئەگەر بیر ورایەکیشیان هەبوو پێم ڕا بگەیەنێ. بەم جۆرە دەروازەی پەیوەندی و دۆستایەتی لە تەك پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقم کردەوە. هەر لەم دەرگایەشەوە دەمەوێ بچمە مەیدان. دیارە عیسی زەبیحی لە بەغدا لەو کەسانە بوو کە لەو کارەدا زۆری یارمەتی دام. ئەگەر بیرو رای یارمەتیدەری ئەو و تێهیشتنەکانی پێشووی ئێمە نەبوایە لەوانە بوو چوونە ناوی ئەو مەیدانە تا ڕادەیەك دەرەتانی نەبوایە. پێ بە پێ ئەم کارانە، لەگەڵ کوردەکان و چەند کەس لە کورد و عەرەب کە لە تاران لەگەڵ رشید کلیدار ناسیبومن و لە عێراقدا کاریان دەکرد و یان ئەگەر کاریشیان بە دەست نەبوایە دەیانتوانی ببنە هۆی پێوەندی، دیدار ووتووێژم کرد. کەم کەم خەریکی

سازدانی تەشکیلاتی جیاجیا بووم لە نێو چینە جیاوازەکانی خەڵکیدا چ ئەوانەی لە ناو دەوڵەتدا یان لە دەرەوەی دەوڵەتدا بوون، لە هەر لایەکەوە لە کوردەکان و عەرەبەکان بۆ تەواو کردنی ئاگاداری خۆم بێ ئەوەی هیچ یەکێ لەوانە لە پێوەندی ئەوانی تر لەگەڵ من ئاگادار بن کەڵکم وەردەگرت. لەم بار و بابەتانەوە بە راستی نەتیجەی زۆر بە نرخم وەرگرت. شەوێك لە ماڵە خۆمدا بووم لە مەڵبەندی مەنسور لە دەوروبەری بەغدا، بیرم لێ کردەوە ئەی بۆچی بۆ رووخاندنی دەوڵەت لە کوردەکان کەڵك وەرنەگرم؟ کە ئەگەر بۆ وێنە گەلاڵەیەك ئامادە و پەسەند بکرێ، ئەو شەوە خەوم لێ نەکەوت و هەر بیرم لەوە دەکردەوە جار جار لە حەوشەی ماڵەکەم دوا جاریش لە شەقامی بەردەرگای دەرێ کە لە نێزیك مەیدانی غارغارێنی ئەسپ لە رژێمی پادشایدا بوو، دەهاتم و دەچووم و هەر بیرم لەو پلانە دەکردەوە.

بۆ رۆژی دوایی زووتر لە رۆژانی تر چوومە سەر کار بە تەلگراف داوای چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەرۆکی سازمانی وەخت کرد. هەر ئەو رۆژە وەڵام درایەوە تا بچمە تاران. لەو سەردەمەیدا بوو کە جاروبار لەملاو لەولا هەواڵی ناجۆر لە بابەت خواڵێخشبوو سپەهبود تەیموری بەختیارەوە بەشا دەگەیی. کاروباری ئەوی تەق و لەق کردبوو، تەنانەت خاوەن پایەکانی دەرەجەی دووەم و سێیەمی ساواکیش لە کار و ئاکاری ئەو خوا لێخۆشبووە نارەحەت بوون. شا لە کودێتایەکی سپیدا ئەم خواڵێخۆشبوو عبد الله هیدایەت یەکەمین سەرۆکی ستادی گەورەی ئەرتەش و سپەهبود حاجی علی کیا سەرۆکی شارەوانی گشتی وڵات – ی لەسەرکار لابرد و لە جیاتی تەیموری بەختیار، ئەو ئەفسەرە پاك داوێن و دروستکار و زانا و نیشتمان دۆست و خەڵکی خۆشەویست و بەدیهێنەری ساواك، خواڵێخۆشبوو سەر لەشکر پاکرەوانی کردە سەرۆکی ساواك، تیمسار سەرتیپ حسن علوی کیا، ئەفسەری بە ئەزموون و کارزان، ئارام، لەسەرخۆ خۆش نێوو بە ئەخلاق کە لە بەرا جێگری تەیموری بەختیار بوو

لەسەر ئەو کارە مایەوە، هەروەك برایەکی میهرەبان، دۆستی بێ وەفا، هاوکاری راست و خوێن گەرم تا دوایین سەردەمی کە دوای شۆڕش لە ئێران بۆی دەرچوو سەبارەت بە تیمسار پاکرەوان و سازمانێ کە بەرپرسی ئەو بە ئەستۆی بوو خزمەتی کرد. (هەرچەند ساڵەها بەر لە شۆڕش لە کاتی لەسەر کار بوونی نەسیری بە پێی داواکردنی خۆی خانەنشین ببوو)... جارێکیان لەگەڵ تەیمور بەختیار بۆ چاوپێکەوتن و وتووێژ لەگەڵ دەوڵەمەند وخاوەن نفوز و کاربەدەستانی سەردەمی رژێمی پاشایەتی عێراق کە رایان کردبوو لە بەیروت ئەژیان، چوومە لوبنان بەختیارم لەگەڵ ئەوانە کردە ئاشنا و لە گفتوگۆیەکی درێژدا لە بارەی بەرنامە و گێرانەوەی رژێمی پاشایەتی بۆ عێراق ئەوانی بە لوتفی پاشای ئێران و هەنگاوەکانی رێکخراوی ساواکی هیوادار کرد. بە ڕاستی کاتێك ئەوان بە تایبەتی بنەماڵە عبد الهادی چەلەبی تێگەیشتن و ئەو کارە (گەلاڵەی پیرۆز و روخاندنی رژێمی عبد الکریم قاسم) کەوتۆتە ئەستۆی تەیمور بەختیار و ساواك رۆژیان پێ خۆش بوو هەرچەند داوای پارەشی لەوان نەکردبوو، عبد الهادی چەلەبی ئامادەیی خۆی بۆ هەموو جۆرە یارمەتی مادی و هۆکاری ئینسانی راگەیاند. عبد الهادی چلبی نەك هەر لە بیروت کوڕێکی خۆی وەك نوێنەر و راپەڕێنەری کارەکانی ساواك لە گەلاڵەی ناوبراودا ناساند بەڵکو یەکێکی تریش لە کوڕەکانی خۆی ناردە تاران کە یارمەتیان بدات بۆ ئەو کارە، لە راستیدا هەردوکیان بە باشی کەڵکیان لێ وەرگیرا.

... من ئەو کوردانەی کە لە رۆژگاری پاشای عێراق خاوەن پلە بوون و دوای کۆدیتا چوبونە بیروت، ئەوانم بە تەیمور بەختیار ناساند، بەختیار نە تەنیا بۆ هاریکاری بۆ رزگای عێراق، بەڵکو بۆ هاوکاری کردن لە بابەت کوردستانی عێراقەوە ئەوانی بۆ تاران داوەت کرد. کوردەکان لەبەر ناوی بەختیار باوەڕیان پەیدا کردبوو کە بە هۆی ئەو ئەتوانن بە مافی خۆیان بگەن، لەوە دەچوو باشیان فیکر کردبۆوە و زۆریشیان یەك بە دوای یەك هاتنە ئێران و کەڵکیشیان

لێ وەرگیرا. (بەختیار لەو سەردەمەدا زۆر غەررا ببوو، بیجگە لە شا ئاوڕی لە کەس نەدەدایەوە. هەرچی دۆستان و هاوکارە دڵسۆزەکانی پێیان دەگوت، بە گوێیدا نەدەچوو، بە ئیعتبار و پشتیوانی ئەوەی کە لە سەفەر بۆ ئەمریکا چاوی بە پریزیدنت جان ئێف کەندی کەوتبووە، و چەند شتێك کە لەو دیدارەدا بە هاوکارەکانی وتبوو، بە گوێی شا گەیشتبوو، وەزعی ئەوی لەرزۆك کردبوو، نەیدەزانی و یا دەیزانی و وەسەر خۆی نەدەهێنا، هەر بەرزاییەك، نزمی لە دوایە).

# پێشنیاری گەلاڵەی سەرکەوتوو

دوای ئەوەی کە موافەقەت کرا کە بێ دیتن و وتووێژ لە گەڵ تیمسار پاکرەوان بچمە تاران، ڕۆژی دوایی کەوتمە ڕێ و گەیشتمە تاران و یەکسەر چوومە ماڵی پاکرەوان و مەسەلەکەم بەم جۆرە بۆ روون کردەوە و گوتم: ((... دیارە لە بواری تەمەن و خوێندەواری و ئەزموونە لە من زێدەتری و لەبارەی پێشینەی کاریشەوە لە من ئاگادارتری. ئەگەر بە وردیش لە ڕووداوەکانی ڕۆژی عێراق ئاگادار نەبی، لانی کەم بە گشتی دەتوانی بارودۆخی ئێستا و رابردووی عێراق لێك بدەیتەوە.

ئەزانی ئێرانیەکان بە کورد و عەرەبەوە، سەبارەت بەسنووری هاوبەش و پێوەندی بنەماڵەیی و پێداویستی ژیان لە سەردەمی حکومەتی عوسمانی و یان پێکهاتنی وڵاتانی وورد و درشتی عەرەبی لەگەڵ عێراق هاتووچۆیان هەبووە ئەوانە میوانی بانگ نەکراو و ئاوارە بوون و بۆ درێژە پێدانی ژیان لە سنوورە پەڕینەوە. لە عێراق خەریکی کاری ڕەشی وەك: حەمباڵی و بۆیەچیەتی و شاگرد قاوەچێتی و ئاو فرۆشی و باخەوانی و نۆکەری و شتی وا بوون. لەبەر ئەوەی بە قاچاخیش سنووریان پەڕاندووە. هەمیشە لە لایەن پۆلیسی عیراقەوە ئازار دراون.

دوای شۆڕشی ١٩٥٨یش دەوڵەتی شاهەنشاهی لەگەڵ عێراق توشی گیر وگرفتی زۆر بووە. لەبارەی ئێرانیەکانی دانیشتووی عێراقیشەوە، رەخنە و سکاڵای بەرپرسانی باڵوێزخانەکانی ئێران ئەنجامێکیوای نەبوە لەم وڵاتە بە ڕواڵەت شۆڕشی یەدا کەس گوێ ناداتە کەس. کەوا بوو دەبێ خەتی سوور بەسەر ئەم هەنگاوانەدا بکێشرێ و هیوامان بە کەڵك وەرگرتن لەم هۆکارانە نەبێ پاشان ئاخافتنی خۆم درێژە پێدا و گوتم: دەمێنێتەوە عیراقیە شیعە مەزهەبیەکانی و کوردەکان کە نەك هەر سەبارەت بە پێشینەی مێژوویی، بەڵکو خۆیان بە هاوڕەگەزی و هاوپەیوەندی لەگەڵ ئێران شانازی دەکەن. ئەڤین و هۆگری

ئاریـایی و هـاو پێوەنـدی و حەزێنەهێنی ئـەوان لەگەڵ ئێران لـە ئـاگری شـەوی نەورۆز و تەقەی تفەنگ و ئاگربازی دا خۆ دەنوێنێ. ئەگەر کوردەکان نـەك هـەر پێنج پارچە بەڵکو بکرێنە هەزاران پارچەش و دابەشیان بکەن، رەگـەز و رەسـەن و پێوەندیان لە ناسیۆنالیزمی ئـێران و کلتـور و ئـەدەب و زمـان و داب و نـەریتی خۆیان لە بیر ناکەن.

ئەوانەی لەو دیو یا لەم دیوی سنوور نیشتەجێن پێوەندیان بـە ئێرانـەوە هەیـە، ئێرانیـان بـەدی هێنـاوە یەکـەمین حکومـەتی پاشـایی ئێرانیـان دامـەزراندووە، لەگـەڵ ئـێران هاتونەتـە دی لـە ئـێران دەمـرن بـەڵام ئـێران هەمیشـە زینـدوو دەمێنـێ. ئێوە دەبـێ لـە بابـەت ئـەم نەتـەوە و ئـەم قەومـە کـە ئـەمڕۆ ئاوەهـا ئـاوارەن و تـەنیا لـە عـێراقدا گیـانی تازەیـان هاتۆتـەوە بـەر و دیـارە ئـەویش ماوەیـەکی زۆر ناخایـەنێ بـیر بکەنـەوە، پشـتیان پـێ ببەسـتن و سـەبارەت بـە گەورەیی ئێران کەڵکیان لێ وەربگرن دوژمنایەتی مەعنەوی و جەنگی زیـهنی لـە مێشك دراوین وەرن لەگەڵ ئـەواندا جیهانێکی باشتر و خۆشتر ساز بـدەن بـەڵام عێراقییـەکانی شیعە مەزهـەب هەرچـەندە لـە بـاری مەزهەبـەوە خـاوەن بـیر و بڕوان، بەڵام هەرگیز خـاوەنی تەشکیلات و ڕێکخستن نـەبوون، نـەیانتوانیوە بـۆ هاوەمەزهەبـەکانی خۆیـان کـەڵکیان هـەبێ. زیـاتر لـەوەی کـە هۆگـری سـەبارەت بـە ئێرانییـە شـیعەکان نیشـان بـدەن نۆکـەری عێراقیـەی سـوننی مەزهەبـە دەسەڵاتدارەکان دەکەن.

ئـەوان خـەڵکێکی بـێ کـارە و تەمبـەڵ و هیـچ و پوچـن و مەگـەر بـۆ قـازانجی شەخسی ئـەگینا خۆناخەنـە مەتەرسیەوەمەزهبیش هـەر لـە منداڵیـەوە چۆتـە گوچکەیان، دەنا بڕوایان پێ نیە و جاری وا هەیە لە شیعەش حاشا ئەکـەن و بە زاراوەی مەزهەبیەکانی شیعە "تەقیە" دەکەن من هیـچ هیوام بـەوان نیـە چونکە هەست بە مەترسی پێوە بـوون دەکـەم. بـە کورتـی بـەم بیـانووە کـە ئـەوان هاوەمـەزەبی ئێمـەن، دەبـێ وازیـان لێ بێنـین و فاتحـەیان بـۆ بخوێنـین. ئـەوەی

عەرزت ئەکەم تەنیا بۆ ئاگاداری خۆت نیە تکا دەکەم بە کاربەدەستانی دیکەش رابگەیێنە، ئەوانەی دەستیان لە کاری عێراقدا هەیە.
عەرەبە سوننەکانی عێراق ئەوەندەیان دوژمنایەتی لەگەڵ شیعە هەیە هەر باس ناکرێ ئەوان ناتوانن هیچ کارێك بۆ ئێمە بکەن. ئەوان نایانەوێ ئێران هەر سەریشی پێوە بێ جا چ دەگا بە هاوکاری. هەموو جۆرە گەلاڵە و بەرنامەیەك بۆ کەڵك وەرگرتن لەوان بۆ دژایەتی دەوڵەتی عێراق راپەڕێنم هیچ بڕوام نە بە گەلاڵە و نە بە خۆیان هەیە.
.... . دوایی رووم کردە پاکرەوان و گوتم: ئەوەی بە کورتی لە بابەت پێوەندی رەگەزیی و قەومی و خەڵکی کوردزمان لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ئێرانیشم کردووە، راستییەکە کە حاشا ناکرێ. بەڵام ئەو بەو مانایە نییە کە کوردەکانی عێراقی بەو خووە ئاکارەوە لایەنگری دەوڵەتی ئێستای ئێرانن ئەگەر ماوەیەك لە رۆژنامە و چاپەمەنی حیزبەکانی کوردەکانی عێراقدا هێرش ناکرێتە سەر رژێمی ئێران لەبەر گۆڕانی سیاسیەتێکە کە دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە کوردەکانی ئێرانی لەبەر چاوی گرتووە و نەتیجەی کار گەلێکە لەو مەڵبەندە ئەنجامدراوە. ئەم کارانە لە چاپەمەنی ئەورووپا دەنگی داوەتەوە و بە رابەرانی کوردەکانی نیشتەجێ لە ئەورووپا و وڵاتانی تر ڕاگەیێندراوە هەنگاو هەڵهێنانەوەی دژی دەوڵەتی عێراق لە مەڵبەندی رۆژئاوای ئێران دەنگدانەوەیەکی ناپەسەندی دەبێ و زیان و زەرەری ئەوە بە کوردەکانی رووبەرووی سنوور دەگا. لە ئاکامدا دەبێتە هۆی ئەوەی نارازی بوونی زیاتر و نەتیجەی ئەوەندەشی نابێ. بۆ وێنە لەم دواییانەدا گەلاڵەیەکی بە ناوی ئازاردەرتان ئامادە کردووە و ئاوی چۆمی (زاب)تان کە لە دەرەوەی قەسری شیرین دەڕژێتە عێراق و مەڵبەندی خانەقین، بەرتان گرتووە و گێڕاوتانەتەوە. لە ئاکامدا چەندین هەزار دار خورما وشك بووە و کشتوکاڵ و مەزرای خەڵکی کوردزمانی بێچارە لە نێو چووە، دەوڵەتی عێراق لەوە کەڵکی وەرگرتووە نەك

هەر زەرەر و زیانەکانیانی بۆ بژاردوون، بەڵکو پڕو پاگەندەیەکی سەختی لەبەشی کوردی رادیۆی عێراق دژی دەوڵەتی ئێران دەست پێکردووە. ئەم گەلاڵە و ئەم جۆرە کارانە دەردێك دەرمان ناکەن، بە پێی ئەم قسە مەشهورە عورزەی خۆت دەبەی و ئێمەش ئازار دەدەی رۆژ بەرۆژ دنیا دەگۆڕدرێ رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە بار و بابەتی سیاسییەوە رەنگ و روویەکی دیکەی پەیدا کردووە بیر و ئیدۆلۆژی جیاجیا دێتە مەیدان کە دەبێ لەگەڵ رۆژگار و ئاڵ و گۆڕی دنیا بچنە پێشەوە ئەگەر لە رۆژگار و لە کات و سات وەدووا بکەون هەموو شتێکیان لە کیس دەچێ. بە ڕواڵە وەرن با پێکەوە دنیایەکی باشتر ساز بدەین. ئەوەی لە ماوەی بوونمدا لە عێراق لێی وورد بومەتەوە دەوڵەتی ژەنراڵ عبد الكريم قاسم، لەگەڵ ئەوەی بە ڕواڵەت دۆستی و خۆشەویستی رواڵەت لەگەڵ کوردەکان بە تایبەت لەگەڵ ڕابەرانی، بۆ وێنە مەلا مستەفا و بەرپرسانی دیکەی حیزبی نیشان دەدا، بیر و ڕای سەبارەت بەوان چاك نییە و ناشییەوێت مادەی ٣ـی بەیاننامەی ژمارە ١ـی شۆرای بەرزی شۆڕش کە ماوەیەکی درێژی لێ ڕادەبرێ، ببا بە ڕێوە و ئیجرای بکا لەگەڵ پێداگرتن و دیدار و وتووێژی رابەرانی حیزبی دیمەکراتی کوردستان لەگەڵ عبد الكريم قاسم، وە باقی بەرپرسانی دەوڵەتی لە مەسەلەی کوردستاندا هیچ جۆرە شتێك لە دڵپاکی ئەوان سەبارەت بە خۆیان هەست پێ نەکردووە. لە چاوپێکەوتنمدا لەگەڵ رابیتی بەرپرسی حیزبی لە مەڵبەندی بەغدا و هەروەها لەگەڵ باقی سەرۆك هۆزەکان و پیاوە بە نفوزە کورد زمانەکانی نیشتەجێی بەغدام ئەنجام داوە، هیچ هیوایەکیان بە ئەنجامدانی کاری بە کەڵك لە لایەن دەوڵەتی عبد الكريم قاسمەوە نیە. دەزانن کە ئەو، مەبەستەکە بە کات رابواردن دەباتە سەر. ئەمە خۆی دەرەتانی باشە و هەل و مەرجێکی لەباری بۆ کەڵك وەرگرتنی ئێمە بەدی هێناوە. بە ئاخاوتن لەگەڵ ڕابەرانی بە پرسی حیزبی ئەتوانرێ خاڵی وەرسوڕان و لە پێوەندی کوردەکانی عێراقی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران بەدی بێت.

هەل و مەرجێ ساز بکرێ کە بتوانرێت باشترین کەڵکی بۆ گۆڕانی ئەم بارەی ئێستا کە لە نالەبارترین هەل و مەرج دایە بەدی بێت و بە مەبەستی پێکهێنانی نفوز و سەرئەنجام دابینکردنی سوود و بەرژەوەندی ئێران کار گەلێ شوێن دانەر ئەنجام بدرێ ئەمە مەسەلەیەکی چکۆلە نیە زۆریش گرنگ و حەساسە خاوەنی جوانی و زەریفی تایبەت بە خۆیەتی، ئێوە دەبێ دژ و دوژمنانی ئێستای ئێران بکەنە دۆستی ئێران و سەرئەنجام ئامادە بکرێن تا راپەڕن و شۆڕش بکەن و مل پێچی لە دەوڵەتی مەتبوعی خۆیان بکەن دەبێ کارێ بکرێ کە ڕابەران و بەرپرسانی کوردەکانی عێراقی لە عبد الکریم قاسم دوور بخرێنەوە، تا هەم کوردەکان لە هەر جۆرە گزی و فزی دەوڵەتی عێراق دوور بن و هەروەها دەوڵەتی عێراق نەتوانێ زیاتر لەوە ئەوان بە داهاتوییەکی نادیار هیوادار و دڵشاد بکات و لەم ڕێگایەوە کەڵکیان لێوەربگرێ. لەم ڕێگا و ڕێبازانەوەیە کە دەوڵەتی عێراق دەتوانێ لە مەڵبەندی خۆرئاوای ئێران کە بە تەواوی بێ بەرژینە و لە بەرانبەر هاوڕەگەزەکان و برایان و خزم و کەس و کاری خۆیان قەراریان گرتووە دەست بکەن بە تێکۆشانی و دژایەتی کردنی دەوڵەتی ئێران بە وێنەی ناوچەیی و بارێ کە تێیدان، هەرچەندە دەتوانرێت لە ڕێگەی هێزی چەکدارەوە لە هەر جۆرە دەست درێژییەك بۆ سەر سنوری وڵات بەرگری بکرێ. بەڵام بەرپەرچدانەوەی هێرش و دەست درێژی لەوبەری سنورەوە کە بە ڕێنوێنی و بە پێی نەخشە بێ و بە نهێنی بە دژی وڵات ئەنجام بدرێ. بەهۆی هێزی چەکدارەوە سەرناگرێ و ناگونجێ. خەڵکی ناوچە و تاکە تاکی خەڵکی ڕۆژئاوای ئێران ئەگەر لە دڵپاکی دەوڵەتی ئێران دڵنیا بن خۆیان باشترین بەرگر دەبن بۆ وڵاتی خۆیان. خۆیان باشترین هۆی ئاگاداری و سەرئەنجام ئەبنە باشترین بەڕێوەبەری کار و بار لەو ناوەدا. تاکە تاکی ئەم دیو ئەودیوی سنوور بە هاریکاری یەکتر و بە پشتیوانی دەوڵەتی ئێران نە تەنیا

تەنگ بە هێزی چەکداری توند دەکەن بەڵکو هەر جۆرە فرۆفێڵ وگزی و فزیەکیش پوچ دەکەنەوە جا لەبەر ئەمە پێشنیار ئەکەم :

بە زووترین کات و بەر لەوەی هەل و دەرفەتان لە دەست بچێ لەگەڵ ڕابەران و گەورە پیاوانی کوردی حیزبی عێراقی وتووێژ دەست پێ بکرێ. وە ئەوانە دنە بدرێن لە بەغدا بڕۆنە دەرێ و بچنە مەڵبەندەکانی باکور و لە ناوچەیەکی شیاودا دەست بکەن بە کۆکردنەوەی لایەنگرانی خۆیان و لە دەوڵەتی عبدالکریم قاسم لەسەر بنەڕەتی ئیعلامیەی ژمارە ٣-ی شۆرای بەرزی شۆڕش مافی خۆیان بخوازن تا کوردەکان بە ناوی نەتەوە و خەڵکی نا عەرەب بناسرێن و مافی ڕەوای ئەوان بە پێی قانون و یاسا دابین بکرێ و ئازادی و دیموکراسی پێك بێ و خەڵکی لە بەڕێوەبردنی کار و باری نێوخۆیی کوردستان بەشدار بن و دەوڵەتی عێراقیش ئەوەی بسەلێنێ خوالێخۆشبوو تیمسار پاکرەوان زۆر بە ووردی سەیری کردم و وتی: یانی ئێمە بە دەستی خۆمان ئاژاوە و سەر ئێشە لە ناوچەی کوردستانی ئێراندا بۆ خۆمان ساز بدەین ئەوان دنە بدەین بۆ ئەو شتانە کە ئەمانیش داوای مافی خۆیان بکەن؟ لە وەڵامدا وتم: ئێمە کاری بە پێچەوانەی قانون ناکەین. ئەگەر کارەکانی ئێمە لەباری بەهێزکردنی کوردەکانی ئەودیوی سنوور کە لە بنەڕەتدا بۆ کز و لاواز و بێ هێزکردنی دەوڵەتی عێراقەوە ببێتە هۆ بۆ بەڕێوەبردنی مادە ٣-ی بەیاننامەی ژمارە یەکی شۆرای بەرزی شۆڕش، چ دەبێ کەلە ئێراندا قانونی پێکهێنانی ئەنجومەنەکانی ئەیالەتی و ویلایەتی لەسەرتاسەری وڵات بەڕێوە ببرێ. مەگەر تا کەی ئەتوانن خەڵك لە بەشداری کردن لە کاروبار و ئازادی و دیموکراسی و حاکمیەت بێ بەش بکەین و لە هەڵدان و پێگەیشتن و دادگەری بێ بەش بن. سەرئەنجام ڕۆژێ دەبێ کارەکانی سازمانی ئاسایش و بیروڕای شای ئێران لەم ڕێبازەدا بە ڕێوە ببرێ ئەگەر بە ڕاستی ئەو شتانە لەسەر دڵپاکی دامەزراوە. ئەبێ ئاسایش و خۆشی و مافی خەڵك لەم ڕێبازەدا دابین بکرێ و و سەرئەنجام خەڵك بە خێر

و خۆشی ئازادی بژین، ئەگەر دەوڵەتی ئێران زووتر دەست بداتە داهێنانی ئەم کارە و داخوازی خەڵك بە پێی قانونی ئەساسی دابین بکا دەیباتەوە دەنا هەل و مەرجێ بەدی دێ کە بەناچاری ئەنجامیان بدەین. یا لە بەرانبەریدا راوەستین و بە دژی خەڵك و ویستە رەواکانی قانونی ئەوان ملە بە ملانێ بکەین. لە هەردوو حاڵدا ئاکامی کار بە سودی رژێم تەواو نابێ. خوالێخۆشبوو پاکرەوان رایگەیاند : چلۆن ئەعلاحەزرەت رێگا دەدا هاوکاری و پشتیوانی لە مەلا مستەفا و لایەنگرەکانی بکەین و پشتیوانیان لێ بکەین، کە لە ساڵی ١٣٢٥ ی هەتاوی لەو سەردەمەی کە هێزی ئەرتەش دەرۆیشتنە کوردستان (مهاباد، ناوەندی کۆماری) بە دژی ئەرتەش راپەری و ژمارەیەکی لە ئەفسەران و دەرەجەداران و سەربازی ئێمەی کوشت و لە پاشان ئاوای سۆڤیەت بوو، و پەنای بردە ئەوێ و لە روانگای دەوڵەتی ئێرانەوە مەحکوم بە مردن کراون موافەقەت دەکا. . وتم: مەلا مستەفا ئێرانی نییە تا لە دادگای ئێراندا بە بێ بەشداری خۆی تاوانباری کرا بێ، گوناح و تاوانی ئەو ئێنسان کوژە (جیناییە) دوای بەسەر چوونی ئەو هەموو ساڵ و مانگە، وە بەر مروری زەمان دەکەوێ و بۆ وەدواکەوتن نابێ بێجگە لەوە دەگونجێ بۆ دابین کردنی سوود و بەرژەوەندی وڵات و میللەت تاوانباران بە مردن لە بەند ئازاد بکرێن و کەڵکیان لێ وەربگیرێ. ئەمە کارێکی بێ پێشینە نییە، چەند جار وا بووە بە درێژایی مێژوو و لە رۆژگارانی جیاجیادا، وە لە وڵاتانی جیاجیا، وە تەنانەت لە ئێرانیشدا شتی وا رووی داوە و بۆ بەرژەوەندی وڵات کەڵکی لێ وەرگیراوە. مەبەست زۆر لەوە گرنگترە کە بروانینە رابردووی دوور و هەل و مەرجی ئێستا لە دەست بدەین، وە لە بیری دابین کردنی بەرژەوەندی ئێستای ئێراندا نەبین. هەم تۆ و هەم ئەعلاحەزرەت روناکبیرن و جوانیش بۆ دوارۆژ دەروانن و برواتان بە بەڵگە و قسە هەیە. ئەگەر بیرو رای من بە بێ کەڵك دەزانن و پێتان نامەنتقییە، لێم وەرمەگرن ئەم قسانە بە شاهەنشا رابگەیەنن تا هەرچی زووتر دەست بەکار بم دەنا بە کۆکردنەوەی

ئاگاداری بێ سەر و شوێن و چاوپێکەوتن بەم و بەو و خۆ خەریك کردن بە بیروڕای دەوڵەتانی هەندەران، بێجگە لە سات و کات رابواردن و پول و دراو خەرج کردن و هێز و هزر بە فیڕۆدان شتی تر نیە. بە درێژایی ئەم چەند ساڵە و کۆکردنەوەی ئەو هەموو ئاگادریانە چ لەبەر تەشکیلات و چ دوای ئەوە چ کارێکی بەسود و بەرهەمدار ئەنجام دراوە. ئەگەر لە بیرتە دووان لەوانە ناو ببە. پاکرەوان گوتی لەگەڵ ئەسلی مەتلەب موافیقم، بەلام مەسەلەیەکی گەورە و گرنگ و قورسە هەرچەند بە بوونی تۆ ئەوەندە ناهومێد نیم. بەلام لەم کات و بارودۆخە ناسکەدا، لە بەجێ گەیاندنی و پاراستنی نهێنی دا گومانم هەیە.

ئەگەر نەتوانین ئەعلاحەزرەت لەم بارەوە بە تەواوی قانیع و دڵنیا بکەین و لەگەڵ پێشنیاری ئێمە موافەقەت نەکا. من دەزانم لەوە دەترسی کە مەسەلەکە ئاشکرا بێ و ببێتە هۆی پێك هەڵبژاردنی دەوڵەتی ئێران و عێراق. لە کاتێکدا ئێمە دەمانەوێ هەر چۆنێك بێ ئەم نێوە پێوەندییە هەر بپارێزین تەنیا رێگای گەیشتن بەو ئامانجە راکێشانی بڕوا و دڵنیایی دەوڵەتی عێراقە. ئەگەر لە بەجێ گەیاندنی گەلاڵەی پێشنیاری تۆدا بچوکترین ئاگاداری بگاتە دەوڵەتی عێراق، ئاکامێکی مەرگیار و ژیانێکی لە قەرەبۆ نەهاتوی بە دواوە دەبێ.

گوتم لەگەڵ بڕوا بەبیروڕاو بۆچوونەکانی ئێوە بە داخەوە سەبارەت بەکەمی کادری لێزان لەبەغداو دوایەش لەناوچەی عەمەلیات کە دیار نیە کام ناوچەی سەرووی عێراق لەبەرچاو دەگیرێ، کارێکی هاسان و سازگار نابێ، لام وایە هیچ کارێك نیە کە نەکرێ. بەدەست ئێمەیە و بەپشت ئەستووری بەبڕواو بەخۆمان بەشوغڵ و ئامانجی لەبەرچاوگیراو سەردەکەوین. ئەگەر بیروراو بۆچوونەکانم وەك گەلاڵەیەك پەسەند بکرێن، ئەودەم رێگای جیاوازو باشتر لەبەرچاو دەگرین و لەنێوباشەکاندا باشتریان هەڵدەبژێرین. ئەوەندەی دەرەتان هەبێ بۆ رازیکردنی شاو گەیشتن بە ئامانج و دابینکردنی بەرژەوەندی موڵك و میللەت لەهیچ فیداکارییەك روو وەرناگێڕین.

پاکرەوان بەدڵنیاییەوە موافەقەتی خۆی راگەیاند و گوتی: چەند رۆژێک لە تاران بمێنەوە. تا سبەی ئەم مەسەلەیە لەگەڵ سەرهەنگ پاشایی باس بکەی و پێی بڵێ پاش دیتنی تۆ لەگەڵ هیچ کەسی باس نەکا تا چاوی بە من دەکەوێ.

رۆژی دوایی چوومە لای سەرهەنگ پاشایی و هەموو ڕێگاکانم زیاتر لەوەی بە پاکرەوانم وتبوو، بۆم روونکردەوە. ناوبراو گوتی: لەگەڵ هیچ کەس باسی مەکەو بچۆوە چاوەڕوانی تەلەفونی من بکە. دوای نیوەڕۆ تەلەفونی کردو گوتی: دوو رۆژی دیکە، واتە رۆژی پێنج شەمۆ مەسەلەکە لەگەڵ شا باس دەکرێ.

# هەوەڵین دیدار لەگەڵ شای ئێران

... پاکڕەوان دووای رازی بوون و بەڵێنی دان. وتی برۆ بۆلای سەرهەنگ دوکتور پاشایی، ئەویش زۆری پێ چاك بوو، لەئاخیردا بۆ روونکردنەوەی گەلالەی پیرۆز بەهۆی سەرلەشکر هاشمی نژاد چوومە لای شا، دووای دەست ماچ کردنی شا، پێی وتم لەبابەت هاوکاری کوردەکانی عێراقەوە چت بەپاکڕەوان وتووە، بۆم باس بکە، منیش عەرزم کرد بەکورتی یان بەدرێژی. وتی بلێ بزانم. منیش لەسیر تا پیواز بۆم روون کردەوە. شا پرسیاری کرد تا چ رادەیەك بڕوات بە مەلا مستەفا هەیە. ئەو کابرایە بەو رابردووە، . لە روانگەی دەوڵەتی ئێرانیشەوە مەحکوم بەئیعدامە، چۆن دەکرێ لەگەڵ ئەو کار بکرێ. جگە لەوەش کەدەڵێی جێگای باوەڕو دڵنیایی ئیمەیە کەوابوو چۆن؟ بەکام دڵنیایی دەکرێ ئەو مەسەلە گرنگ و ناسکەی لەگەڵی باس بکرێ؟ لەوەلامدا وتم، هیچ جێگای بڕوا نییە، بەلام ئەگەر ئەو رابەرانی دیکەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق پێشنیاری ئێمە وەرگن بەسوودی ئێمەیەو دەتوانین زۆریان کەلك لێ وەربگرین ئێمە لەسەرەتاوە هەندێکیان کۆمەك دەکەین، ئەگەر باش جوولانەوەی، یارمەتیان دەدەین، دەنا لێیان دەبڕین، تازە ئەگەر چەند دانە تفەنگی بڕنەوو کە هەزاران لەوانە لە ئەنبارەکاندا بێ کەلك کەوتبوون، یا چەند ملیۆن فیشەك و کەمێکیش پارە. ئەوەندە بۆ ئێمە گرنگ نییە لەو بابەتەوە یارمەتیان بدەین. ئەمە تاقیکردنەوەیەکە تا بزانین. چەندیان کەلك لێ وەردەگرین شاتاوێك ڕاما لە بارەی باروذۆخی عێراق و هەڵکەوتنی عبد الکریم قاسم و نفوزی ناسر لە عێراق و بە تایبەت تێکۆشانی حیزبی قەومی عێراق و لایەنگرانی چەند پرسیارێکی کرد وەلامم دایەوە. پاشان وتی برۆ کاری خۆت بە ووردی ئامادە بکە و بیدە بە پاکڕەوان. کاتێ لە لای شا هاتمە دەرێ یەکڕاست چومە ماڵی پاکڕەوان.

# ئامادە کردنی گەلاڵە و دەستکردن بە کار

دوای ئەوەی چوومە لای پاکرەوان، دەستوری پاشام بۆ گێرایەوە و لە پاشان چومە لای سەرهەنگ دکتۆر پاشایی، ئەویش وتی قسە و باسەکە بۆ تیمسار سەرتیپ حەسەن عەلەوی کیا جێنشینی من بگێرەوە، لە پاشان بە ڕێنوێنی دوکتۆر پاشایی (گەلاڵەی پیرۆز)م ئامادە کرد. دوای پەسەند کردن لە لای شاوە دەست بەکار بووم. یەکەم لەو مەسەلە گرنگانەی لە قۆناغی هەوەڵدا لەبەرچاو گیرا بوو، چاوپێکەوتنی من بوو لەگەڵ یەکێ لە سەرۆکەکانی هەڵکەوتووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە بەغدا و لەگەڵ باسکردنی مەسەلە و ڕاکێشانی موافەقەتی ئەو، ڕێبەرانی دیکە و بە تایبەت شەخسی مەلا مستەفاش لە مەسەلە ئاگادار بکەین. ئەبێ بزانین ئەگەر هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سیاسی بەڵێنیان بدایە، بەلام مەلا مستەفا ڕازی نەبوایە، هیچ کارێك سەری نەدەگرت (ئەمە بوو واتای ئازادی و دیموکراسی لە حیزبێکدا بە ناوی دیموکراتی کوردستان. ڕابەرە خوێندەوارەکانی دیکەی حیزب لەگەڵ ئەم جۆرە بیروڕایەی مەلا مستەفا دژ بوون، بەلام نەیان دەتوانی لە قسەی بارزانی دەرچن، چونکە کاری خۆکرد و چاری نایێ. ئەمە بۆتێك بوو کە خۆیان دروستیان کردبوو، باشاریان نەدەکرد، دیارە حیزبەکانی دیکەش هەم لە عێراق و لە وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵات هەروان ) جا بۆ ئەوەی زووتر دەست بەکار بم بە گوێرەی ئاگاداریەکی لە بەغدا وەدەستم هێنابوو دەمزانی عومەر دەبابە، یەکێك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سیاسی، چۆتە کۆی سنجەق، جارێك لە ماڵی یەك لە سەرۆك عەشایری عێراق دانیشتووی بەغدا نابراوم دیتبوو سەبارەت بە مەسەلەی کورد و کوردستان باسێکی زۆرمان هەبوو. پێم باش بوو لە جیاتی چاوپێکەوتن و توتووێژ لە بەغدا لەگەڵ خەڵکی تر کە بێ ترس نەبوو، لە ڕێگای ڕۆژئاوای ئێران بە قاچاخی بچمە عێراق و هەر چۆنێك بێ چاوم بەو

بکەوێ و مەسەلەکەی لەگەڵ باس بکەم و داوای لێ بکەم گورج بچێتە بەغدا و لە پێشدا مەسەلەکە لەگەڵ برایم احمد و جەلال تاڵەبانی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و سیاسی باس بکا و پاشان لەگەڵ مەلا مستەفا و نەتیجەش لە بەغدا بەهۆی بەرپرسی لقی حیزب لە بەغدا بە من ڕابگەیەنێ.

سەرئەنجام لە شاری کەرکوك چاوم بە عمر دەبابە کەوت، لە پاشان ئەو بەرەو بەغدا و منیش بەرەو تاران کەوتینە ڕێ کە زۆر زوو لەوێشەوە بڕۆمەوە بەغدا، پاش تەسلیمی ڕاپۆرتی هەوەڵین هەنگاو کەبوو بە مایەی خۆشحاڵی پاکرەوان و سەرهەن پاشایی، مەسەلەکە لەگەڵ شاش باس کرا. پاشان گەڕامەوە بۆ بەغدا و چاوەڕوان بووم تا رابیت یا بەرپرسی حیزبی لە بەغدا چ وەڵامێکم بۆ دێنێ.

# بەڵێنی هاوکاری کردن

هەر بەو جۆرە لە بەرا رامگەیاند، ترسی ئەوەمان هەبوو نەبادا گێرەو کێشە لە لایەن دەوڵەتی قاسمەوە بۆ مەلا مستەفا و بەرپرسانی دیکەی حیزب پێش بێ، ئەوە بوو لێبراین هەر کاتێ بەڵێنی هاوکاریان بە ئێمەدا پێیان بڵێین بە هەر بەهانە و هۆیەکەوە بێ بەرە بەرە لە بەغدا دەرکەون و بچنەوە شیمال (باکور).

دوای چەند رۆژ عیسا زەبیحی بەرپرسی لقی حیزب لە بەغدا کە بەشی هەرە گرنگی ئەرك و ئەسپاردەی ئەم لقە بەدەست هێنانی ئاگاداری بوون لە ئیدارەکانی دەوڵەتی و عەسکەری و ئاگاداری (جاسوسی) و هەروەها کارگەلی پشتیوانی کردن و چاوورا و بووزەبیحی لەگەڵ رابیت هاتنە لام بەو نیشانەی کە لەگەڵ عمر دەبابە دامانابوو، بەڵێنی بنەرەتی مەلاو رابەرانی پێ راگەیاند، بەو مەرجەی لەگەڵ ئەوانیشدا راستەخۆ قسە بکەم، لە خۆشیان واقم ورما بوو. لە خۆشیان لاقم وەعەرزی نەدەکەوت. مەسەلەی گریمانی مەترسی لە لایەن دەوڵەت و کەوتنە رێی وردە وردەی سەرۆکەکانی حیزبم بە بەرپرسی حیزب راگەیاند و وام لێکرد کە ئەگەر رووداوێك هاتە پێش ئاگادارم بکا.

.... دوای چەند رۆژ ئاگادار بووم کە مەلا مستەفا بە بیانووی جەژنی قوربانەوە چۆتە مەڵبەندی بارزان، وە هەروەها بەرپرسانی دیکەش بە بیانوی جۆر بە جۆر گەڕابونەوە باکوور ماڵە خۆیان و یا لە بەغدا خۆیان شاردبۆوە، لەبەر پرسی حیزب لە بەغدا داوام کرد تا عمر دەبابە و جەلال تاڵەبانی دیاری بکەن تا بە دزیەوە بڕۆنە ئێران تا لەگەڵ بەرپرسانی سەرەوەی ساواك دیدار و وتووێژ بکەن. لام وایە لەم چاوپێکەوتنەدا بۆ راپەڕاندنی گەلاڵەیەك کە ئامادەمان کردووە و بەشێکی لە ئەستۆی حیزبە تێگەیشتن و لێ حاڵی بوونی تەواو دێتە دەست.

لە چاوپێکەوتنی دوایی راگەیەنرا کە دوو کەس بەناوی عومەر دەبابە و علی عەسکەری کەلە ئەندامانی کۆمیتەی سیاسی و لە کەسانی ناسراو ئازا و بە

جەرگی حیزبی بوون ناودێر کراون. من کە لێکمدایەوە و ئامادەیی زەمینەم هەبوو، رۆژ و سەعاتم دیاری کرد کە ئەو دوو کەسە لە نوختەیەکی سنووری بەرانبەری سەردەشت و لەوێوە بەبێ ئاگاداری کەسێك لە رێکخراوەکانی تری ئەرتەش یا مەدەنی بچنە تاران و لە ئەمیرابادی شیمالی لە مالی من نیشتەجێ بن.

وەلامی هاودەنگی هاتەوە. من گورج چوومە تاران و تەرتیبی کارم ئامادە کردبوو، کە پاکرەوان پێی راگەیاندم کە پاشا ئەمری کردووە خۆم بچمە سەردەشت و لەو پەڕی نهێنی دا سەبارەت بە هێنانی نوێنەرانی حیزب هەنگاو بنێم هەر بەم جۆرەش دەست بەکار بووم. چوومە سەردەشت و شەو لە سنوور پەڕیمەوە لە گوندێکی نزیك قەلادزە کە مولکی سەرۆك عەشیرەتێکی پشدەری عێراقی بوو، هەر دوو کەسم چاوپێکەوت و دووای کەمێك حەسانەوە بە گورجی بە سواری ئەسپ بە لارێدا لەگەڵ دوو کەسی چاوساخی خەلکی ناوچە و شارەزا گەراینەوە بۆ سەردەشت بە سواری جێبێك کە لە تارانەوە هێنا بووم گەیشتمەوە تاران و لە مالی من دانیشتن. لە ماوەی پێنج رۆژدا کە ئەو دوو کەسە لە تاران بوون، لە تەواوی ئەو مەبەستانەی کە لە گەلالەکەدا هاتبوون بەلێنی هاوکارییان داو هاتینە سەر ئەوە کە من برۆمە باکوور لەگەڵ مەلا مستەفا و رابەرانی دیکە دیدار و وتووێژ بکەم و لەگەڵ خۆشم چەك و کەل و پەلی پێداویست و پول و دراویان بۆ بەرم. هەرچەند پێم داگرت تا یەکێ لەو دوانە برۆنە دیداری شا، بەلام شا بەلێنی نەدا و هەلی گرت بۆ دووایی. شا نەیدەویست خۆی لەسەرەتای کارەوە گیربدا کە نەکا ببێتە هۆی نابەدلی لە نێوان ئێمە و دەولەتی عێراقدا. داهاتویش نیشانی دا کە حەق بە شا بووە. ئەو دوانەمان هەروەك هێنابوو. هەر ئاواش بردمانەوە تا گوندێك نێزیکی قەلادزە. جا دوای شەوێك خۆم گەرامەوە بۆ تاران و خۆم ساز کرد تا برۆمە باکوری عێراق بۆ دیدار لەگەڵ مەلا مستەفا و رابەرانی دیکەی حیزب.

# سەربادان و دەستپێکردنی شەڕی پارتیزانی لە کوردستانی عێراقدا

باس کردنی ئەم هەنگاوانە کە بۆ ئامادە کردنی چەك و قۆرخانە پارە و کەل و پەلی پێداویستی حیزب لەکاتی شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هاویژران لێرەدا بە پێویستیان نازانم. ئەوەندەیە هاتوچۆی من بۆ گەیاندنی پێداویستەکانی شۆڕشی کورد لە پلەی تاقیکرنەوەدا زۆر سەرکەوتوانە بوو. لەو سەفەرە بۆ باکوری عێراق نەمتوانی چاوم بە مەلا مستەفا بکەوێ، بەلاّم لەگەڵ بەرپرسانی حیزب قەرارم دا کە بەرە بەرە لە دەوڵەتی عێراق ویستی خۆیان بخوازن و بە هەڕەشە و گوڕەشە دەست بدەنە چەك، لەم سەفەرەدا بوو کە بۆ دووەمین جار چاوم بە برایم احمد سکرتێری گشتی حیزب و جەلال تاڵەبانی و بەرپرسانی دیکەی کۆمیتەی سیاسی کەوت و لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پێشتر ناسیاویم نەبوو، ناسیاو بووم زۆرمان پێکەوە قسە کرد. دووپاتم لەسەر ئەوە کرد کە ئەگەر لە قۆناغی ئەوەڵی ڕاپەڕیندا بتوانن راستی و دروستی خۆیان نیشان بدەن هیوایان بە وەرگرتنی چەك و تەقەمەنی و یارمەتی دیکە هەبێ. دەنا دەوڵەتی ئێران کارێکتان بۆ ناکات، لەسەر ئەو باوەڕەم ئەو بەڵێنانەی نوێنەرانی ئێوە بە من و پاشان لە تاران بە بەرپرسانی ساواکیان داوە رێزی لێ بیگیردرێ و بۆ ئەنجامدانی تێبکۆشرێ. دوای گەڕانەوەم بۆ تاران گورج بەرەو بەغدا کەوتمە رێ و چاوەڕوانی نەتیجەی هەنگاوەکانی دوایی بووم.

لە سەرەتای فەوریە یا مارسی ١٩٦١ بوو کە هەواڵی کوژرانی پۆلیسێکم لە شاری سلێمانی بە هۆی دار و دەستەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و چەککردنی پاسگایەکی ژاندەرمەریم، پێگەشت. لە بەغدا قاو بوو کە مەلا مستەفا چۆتەوە بۆ بارزان ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ بەغدا و دەترسان کە لە باکوور

شەڕ دەست پێ بکرێ. بەو جۆرەی بەرپرسێکی حیزبی لە بەغدا رایگەیاندبوو. ناوەندێکی عەمەلیاتی لە (ماوەت) سەر بە ناوچەی سلێمانی کە خاوەنی بار و بابەتێکی پتەوو ئاستەمە لە ڕوانگەی عەمەلیاتی پارتیزانیەوە. بەهۆی حیزبەوە دامەزراوە (ماوەت جێگایەکە لەبەر گرنگی هەڵسوڕانی چەکداری لە شەڕی نێوان عێراق و ئێراندا چەند جار بەهۆی هێزی سەربازی هەر دوو وڵات دەست بە دەستی پێکرا). کوردەکان چ حیزبی و نا حیزبی روویان دەکردە پایەگای ماوەت و دوای چەکدار بوون دەیاننارد نە ناوچە جیاوازەکانی چیا کە وردە وردە دەست بەکاری ئازاردان و پارتیزانی بکەن. من دڵم لێی دەدا، نەوەك كۆسپێك بێتە رێگای ئەم کارە. دوای سێ مانگ کە باش دڵنیا بووم کە بەقسەی ئێمەیان کردووە چوومەوە تاران و خەریکی راپەڕاندنی قۆناغی دووایی گەڵاڵە کەم بووم و ئەمە قۆناغێکی زۆر گرنگ و ناسك بوو، کەوتمە شوێن ئەوە تا پلەی دووەم دەست پێ بکرێ و دەبوایە زۆر بە نهێنی و بە دزیەوە هەنگاو هەڵێنینەوە، دیارە کەند و کۆسپێکی زۆرم لە رێگادا بوو بە تایبەت لە بردنی چەك و تەقەمەنی و هێنانە دەرێ ئەوانە لە ئەنبارەکان، بێ ئەوەی دەنگ بداتەوە بە تایبەت کە ئەبێ شا دەستور بدات تا بتوانرێ چەك وەربگیرێ لە شا وە بگرە تا ئەنباردارو وەرگران و بەرپرسانی بار و گوێزانەوەی تەقەمەنی، کە فێر کرێن چۆن ئەو کارانە راپەڕێنن، بێ ئەوەی بە گوێ هاوکاری خۆی کە پێکەوە لە هۆدەیەکدان رابگەیەنێ. هەر چۆنێك بێت تا ئەو ساتە لقی ساواك لە سەردەشت نەبوو، دیارە پێویست بوو لقی ساواك لەوێ دامەزرێ، ئەوە بوو یەکێك لە کارمەندانی کوردەکە زۆر جێگای دڵنیایی بوو، دووای فێر کردن و بارهێنان بۆ ئەو کارە لە سەردەشت کرایە سەرۆکی ساواکی ئەوێ و ناردرا تا بە خێرایی بۆ دۆزینەوەیشوێن و دامەزران و کردنەوەی هەنگاو بنێ. زۆر بە نهێنی و پارێزگاری بارکردنی چەك و قۆرخانە و پارە و شتی تر دەست پێکرا. بۆ دا و دەرمان کردنی بریندارات یا نەخۆشان دکتۆرێك لە ساواك بە دەرمان و

کەرەستەی پێویست ئامادە کرا تا لەگەڵ دکتۆرێکی کورد زمان لە نێو سەربزێوان یا بە قەولی خۆیان پێشمەرگەکان بوو بۆ سازدانی خەستەخانەیەکی دەشتەکی کار بکەن.

لە روانگەی کۆنترۆڵ و کۆکردنەوەی ئاگاداری و راگەیاندنی نیازی پێشمەرگەکان و بیروڕای بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، پێویست بوو کە کەسایەتیەکی سەربازی بەرپرسی ئەو کارانە بە ئەستۆوە بگرێ. ئەوە بوو لە نێو ئەفسەرانی ساواکدا سەرهەنگ ئیرج مەنسور کە خۆی کورد و لە پاشان دەرەجەی سەرتیپی وەرگرت، بووە بەرپرسی ئەو کارە کە چەند ساڵ لەمەو بەر مرد، بە گوێرەی قەرار و مەدار بڕیار درا یەك دەستگای بێسیمی قەوی بۆ پێوەندی کردنی سەرانی پارتی لەگەڵ تاران لە بنکەی ئەوان دابمەزرێ، ئەم دەزگا بێ سیمە لەگەڵ بەرپرس و یاریدەدەری و لەگەڵ کەل و پەلی پێویست ئامادەکراو بەرێ کرا بۆ ناوچە. کاروانی بەڵێندراو زۆر بە نهێنی لەگەڵ مندا بە نێو کوردستانی ئێراندا لە رێگای سەردەشتەوە بەرەو بنکەی حیزب بەرێ کرا.

لە بنکەی حیزب سەرهەنگ مەنصور بە ناوی نوێنەری تەواو ئیختیاری ساواك بە سەرانی حیزب بە تایبەت بە ئیبراهیم احمد کە سکرتێری گشتی و بەرپرسی بەڕێوەبردنی ئەم کارانە بوو ناسێندرا، دەستگای بێ سیم دامەزرا و یەکەم پێوەندی لەگەڵ سەرۆکی ساواك لە تاران گیرا و پێیان ڕاگەێندرا کە کەل و پەلەکانمان گەیاندۆتە بنکەی پارتی و تەسلیمیان کراوە. ئیتر پێویست بوو چاوم بە مەلا مستەفا بکەوێ و هەرچی زۆرتر خۆم بگەیەنمە بەغدا تا پیاوەکانی ئەمنی عێراق هەست بە شتێ نەکەن، جا ئەوە لەگەڵ عومەر دەبابە فەرماندەی تازەی یەکێ لە هێزە پێشمەرگەکان و چەند کەسی دیکە لە پێشمەرگەکان چوینە بەرزاییەکانی شیرین جێگای دانیشتنی مەلا مستەفا. تەواوی ئەو قسە و باسانەی لە نێوان من و هاوڕێکانی ئەو و بیرو ڕاو ویستی دەوڵەتی ئێرانم بۆ گێڕایەوە و داوام لێ کرد کە لە باروودۆخێکی ئاوادا نەك هەر دەبێ پیاوانە کار

بکا، بەڵکو دەبێ نیەت باشی خۆی و ڕاستی هاوکارانی بە دەوڵەتی ئێران نیشان بدا و ئەوان لەو کارە پەشیمان نەکاتەوە. بە زاراوی خۆی قەولی مەردانەی دا. هەندێ دراو کە لەگەڵ خۆم بردبووم پێم دا.

فرۆکە دۆژمەرەوەکانی سوپای دووی کەرکوک جار جار روویان دەکردە ئەو مەڵبەندانە. ئێمە کە لە چەند رۆژی دواییدا لە بنکەیەکی بەر بڵاو و پارێزراو کە سەنگەری رۆژانەی مەلا بوو، دانیشتبوین، داوای لە من کرد نیازی پێشمەرگەکان و ژمارەی ئەوان زیاد لەوەی هەیە بە دەوڵەتی ئێران ڕابگەیەنم تا چەك و شتی پێداویستیان بۆ دابین بکرێ. ئەو دەیویست ژمارەی پێشمەرگەکان بە دەهەزار کەس بنوسرێ و بەو پێوەندانەش چەك و تەقەمەنیان پێ بدرێ. دوای دەمەتەقەیەکی زۆر وتم من کارمەندی ئێرانم و موچانە لەو وەردەگرم و دەرسم خوێندووە و بۆ خزمەت کردنی فێرکراوم و بار هاتووم، ناتوانم بە پێچەوانەی ویژدانم کار بکەم، ئەگەر لات وایە کورد زمانم و ئەوەی تۆ و رابەرانی حیزب دەتانەوێ پێم بکەن وانیە ئەمە هەڵەیە، من دەبێ بێ لایەنی خۆم نیشان بدەم و ئەوەی راستیە رای بگەیەنم ئێستا کە شا و بەرپرسانی ساواك بروایان بە من کردووە و سوێندم خواردووە کە خزمەت بە موڵك و میللەت بکەم کاری وام لە دەست نایە. خوێنەرانی بەرێز عمر دەبابە زیندووە و ئێستا لە لەندەن دەژی، دەتوانێ لەم بارەوە داوەری بکا. گوێم نەدا قسەکانی مەلا مستەفا و بۆ سەر لە ئێوارە خۆم ئامادەی رۆیشتن کرد، مەلا مستەفا پاکەتێکی پڕ لە دیناری عێراقی کە خۆم رۆژی رابردوو چەند هەزار قاتی ئەوەم پێدابوو، بە منی‌دا، وتم چییە؟ وتی : بۆ زارۆك و خێزانت دیاری پێ بکڕە. لێم وەرنەگرت و پێم وت : من ئەو دراوەم هەیە بە تایبەت کە لە ماموریەتی ئێرەدام زیاد لە ڕادە موچانە وەردەگرم، وتی: من لە ئێران بووم ئەفسەران دەناسم، تۆ بۆچی وا دەکەی، وتم : ئەو رۆژگارە گۆڕدراوە و ئەفسەران وا نەماون، ئەمرۆ ئەوان تێر و تەسەلن و ئەیانەوێ پیاوانە بژین.

نان و حەڵوا قەند و شەکر لە نێوان ئەو پێشمەرگانە دابەشکرا کە لەگەڵ ئێمە هاتبوون لە سەرەتای شەو لەگەڵ عومەر دەبابە کەوتینە رێ. دوای دوو رۆژ لە سنوور تێپەڕیم و خۆم گەیاندەوە تاران.

کاتێ چوومە تاران زیاتر لە ۲۵۰۰ پێشمەرگەم رانەگەیاند، هەرچەند کاتێك کە لەو چیاو چڕە بووم، دیاری نەکرا ژمارەیان لەوە زیاتر یا کەمتر بوو، لەو سەفەرەدا بۆ دڵنیایی خۆم بە بیانوی شای ئێران لە مەلا مستەفام ویست بۆ دڵنیایی شا و بەرپرسانی سەرەوەی ئێران. پشتی قورئانم بۆ مۆر بکا و سوێندی وەفاداری بۆ شا و دەوڵەتی ئێران بۆ بخوات. مەلا مستەفا وتی: من مەردم، بەڵێنی کە داومە سەد قات پتر ترە لە بەڵگە و سەنەد جێگای دڵنیایە، هەرچەند ئەگەر پێت وا باشە ئەوەش دەکەم، منیش بێ یەك ودوو قورئانێکم پێ بوو لە کیفەکەم دەرم هێناو شتێکم لەو بوارەدا نووسی کە باسم کرد و پێم دا تا ئیمزای بکات. لە گەڕانەوەم بۆ تاران دام بە پاکرەوان تا بیدات بە شا. هەرچەند لە زۆر بار و بابەتەوە بە راستی و ناردروستی ئەو دەرکەوت. پشتگیری قورئان کاری تێکرد و بە سزای خۆی گەیاند. باوە کە تووشی سەرەتان (شێرپەنجە)ی خوێن ببوو، ساڵەهای ساڵ بوو ئازاری ئەدا. دوای هاتن بۆ ئێران کە باسی لێ دەکرێ، بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشیەکەی بەرەو ئەمریکا بەرێ ئەکرا. دەواو و دەرمان شوێنی بۆی نەبوو تا سەرئەنجام لە واشنتۆن دیسی مرد. بە پێی وەسێتی خۆی تەرمەکەیان هێنایەوە ئێران لە شنۆ لای سنوور لە مەڵبەندی ئازربایجانی رۆژئاوادا ناشتیان.

کارێکم لە تاران نەبوو دەبوو هەرچی زووتر بڕۆمەوە بۆ بەغدا هەر چەند هێزی پێشمەرگە ووزەیان لە خۆ نیشان ئەدا دوو ئەوەندە هێزەکانی سەربازی عێراق بەرەو باکوور دەکەوتنە رێگا و هەڵمەت بردن، بەڵام باشاری پێشمەرگەیان نەدەکرد چونکە بڕوایان هەبوو هەر چەند لە بابەت چەك و

تەقەمەنی وەك هی دەوڵەتی عێراق تەیار نەبوون رۆژ بە رۆژ پەرە بەشۆڕش دەدرا و ئاژاوە زۆرتر دەبوو. وای لێ

هاتبوو كە تەنانەت ئەفسەر و دەرەجەداری سەربازی و شارەوانی عێراق كە زۆربەیان كورد بوون، داهاتنە نێو شۆڕشیان[1].

لە بیرمە سەرۆكی مخابراتی پۆلیسی ئوستانی سولەیمانی كە ئەفسەرێك بوو هەڵهات و چووە ماوەت بنكەی بزوتنەوەی سەربزێوان و لەوێ دەستی كرد بە خزمەت كردن كە لە كارو باری موخابەرایەتیدا، زۆربەی تەلەگرافی نهێنی هێزەكانی سەربازی عێراقی دەشكاند و و لەو رێگایەوە هێزی پێشمەرگەی بە چكۆلەترین بزوتنەوە و عەمەلیاتی هێزەكانی عێراق لە بەرا ئاگادار ئەكرد. خزمەتەكانی ئەو ئەفسەرە كە بە صابر نێو دەبرا بە درێژایی دە ساڵ خزمەتی كە لە نێو شۆڕشدا كردی بە راستی زۆر بەرچاو سەرنج راكێش بوو بەڵام لە سۆنگەی بێ رێزیەك لە مەلا مستەفا سەبارەت بەو ئەنجامی دا و سوكی كرد، خۆی كوشت وە گشت ربەرانی حیزب و پێشمەرگە و هاوسەنگەرانی ئەوی داغدار كرد. وەزعەكە دوو ساڵ بەو جۆرە بەردەوام بوو، و باشار نەكرنی هێزی چەكداری عێراق لە شەرێكدا لە باكوری عێراق بووە هۆی دڵساردی خەڵكی لە دەوڵەتی عبد الكريم قاسم و رۆژ بەرۆژ هۆی ئاڵو گۆڕی پێك دێنا.

---

[1] نووسەر لە هەموو شوێنێ ووشەی"شۆرشی" فارسی بەكر دێنێ بە مانای سەربزێوی، ئاژاوەچی. ووشەی ئینقلاب بە كوردی دەبێتە شۆڕش بەكار ناهێنێ. و.

# داكەوتن وسەركەوتنی عبدالسلامەكان و باسی ساكە رەشە

هەر وەك لەبەرا رام گەیاند ژەنراڵ عبد السلام عارف هاوكاری تاقانەی كودێتای ٥٨ی، عبد الكریم قاسم دوای ئازاد بوون لە بەندیخانە بە ئارامی دانیشت تێكۆشانی نهێنی خۆی لەگەل بەعسیەكان بە سەرۆكایەتی احمد حسن البكر كردە یەك، نەتیجەی تێكۆشانیان لە ساڵی ١٩٦٣ بوومە شۆڕشی دووەمی عێراق كە ژەنراڵ قاسم پیاوی دەرەجە یەكی عێراق بووبە قوربانی. عبد السلام عارف بووبە سەرۆك كۆمار و بەكر بوو بە سەرۆك وەزیران. دەورانی قودرەتی قەومیەكان لایەنگرانی ناسر كە عبد السلام خۆی لایەنگری زۆر توندی ئەو بوو، پەرەی گرت، كوشت و بڕی بێ ژمارەیی كۆمۆنیستەكانی عێراق لەم دەورەدا لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا بەناوبانگە. میسر و سوریا لە بەرا یەكێتیەكەیان بەدی هێنا، هەر كە شۆڕشی ٦٣ سەركەوت، عبد السلام عارف چووە قاهرە و بووە هۆی پێوەندی دۆستایەتیەكی نیوەچڵە لە نێوان دەوڵەتی عێراق و میسردا. هەرچەند ئەم سێ یەكێتیە بەرەبەرە لەبەر یەك هەڵوەشایەوە سەركردەكانی هەر یەك لەو وڵاتانە بەسەردان كفنیان رازاندەوە ئێستاش شوێنەواری ئەو سێ ئەستێرەیە لەسەر ئاڵای عێراق ماوە و پاك نەبۆتەوە.

عبد السلام عارف وا بیری دەكردەوە تا لەدەست شەڕی كوردان لە باكور رزگار نەبێ ناتوانێ هیچ كارێ بۆ عێراق بكا. جا لەبەر ئەوە تێكۆشا بە هەر چەشنێك بێ، دووایی بە شۆڕش بێنێ. ئەمەش لەو سەردەمەدا بوو كە دەوڵەتی ئێران پێوەندی خۆی لەگەڵ میسر بڕی، وە ناسر بە هەموو توانایەوە بۆ ئاژاوە نانەوە لە ئێراندا خەریك بوو، ئەو یەكێتیە ناسری لە كەناڵی سوێس و دەریای سورەوە هێنایە دجلە، ئەویش بە هاوكاری بەعسیەكان دوژمنی ئێران و دەوڵەت و

نەتەوەیی ئێران بوون. لەم سات و کاتەدایە کە ئێمە دەبێ بە تەواوی هێزەوە پشتیوانی لە هێزی چەکداری کوردان لە باکوری عێراقدا بکەن و رایان بگرین جا ئەوەی پێوەندی بە مەسەلەی عێراق و بە جیا بە دەرەوەی مەسەلەی کوردەکان لە تەك عەوامل و عەناسری دژی دەوڵەت و هێرش و دەست درێژی ناسر ئەنجامم دەدا.

لەگەڵ بەدی هێنانی شەبەکەی ئاگاداری کە لەبەرا لەنێو چینەکانی ئیداری ونائیداری دا هەبوون لەهەنگاوە تایبەتی یەکانی عبدالسلام عارف هێزەکانی لایەنگری ناسرو رژێمی ئەو ئاگادار دەبووم و هەوڵەکانم رادەگەیاند.

وتم عبد السلام عارف یەکەمین کاری بەرچاوی خۆی بە دامەرکاندنی کاری کوردەکان دەزانی لە وتووێژەکان و قسەهاوێژەکانی خۆیدا هەمیشە لە برایەتی لەگەڵ کوردان و یەکپارچەیی عێراق و هەبوونی دەستی بیانی لە نێو کوردان و تاکە تاکە پیاوی خراپ و جاسوس لە عێراقدا دەدوا و دەئاخەفت.

پێی بە پێی ئەم کارانە. بەرپرسی پارتی دیموکراتی کوردستان شاخەی بەغدا خەبەری دەدامێ. کە هەیئەتێك لە ژێر چاوەدێری ژەنەراڵ فوئاد عارف وەزیری راوتەکبیر "دەوڵەت" لە مەسەلەی باکوور خەریکی تێکۆشانێکن وەك ئەوە دەیانەوێ چەند کەسێك بۆ وتووێژ لەگەڵ مەلا مستەفا بنێرنە باکور. من دڵنیا بووم بەو قەول و قەرارەی لەگەڵ پارتی، ئەو هەموو یارمەتی و پشتیوانی کردنە چەندین ساڵە، و پێوەندی لەگەڵ مەلا مستەفا و رابەرانی حیزب کە هەمانە، ناگونجێ بە بێ بیر و رای دەوڵەتی ئێران دەست بدەنە کارێ دیارە ئەم دڵنیاییە لە لایەن رابەرانی حیزبەوە زۆرترە تا لە لایەن مەلا مستەفاوە.

هێشتا راپۆرتی من بە تەواوی نەگەشیتبوە تاران کە بەیاننامەی شەڕ وەستانی نێوان شۆڕشیانی باکور و سوپای عێراق لە رادیۆ بەغدا بڵاو کرایەوە. رۆژنامەنوسەکانیش لەم بوارەدا. بە تایبەت زۆربەیان هێرشیان بۆ سەر ئێران بە درێژی نوسیان، ئەوەی لە بەیاننامەکەدا هاتبوون، هەبوونی دوو هەیئەت

بوو، له هەردوو لا بۆ وتووێژ کردن و دابین کردنی بیروڕا و ویستەکانی مەلا مستەفا رابەری پێشمەرگەکانی کورد. لەو بەیاننامە و نووسراوەی رۆژنامەکانیشدا هیچ ناوێك له حیزب نەبرابوو، و نەهاتبوونە ژمار.

بێ درنگ بانگ کرامەوە تاران و دووای لێکۆڵینەوە له رووداوەکانی چەند ساڵەی عێراق دووبارە گەڕامەوە بۆ عێراق تا لەگەڵ مەلا مستەفا قسە بکەم و بدوێم. بەر لە چاو پێکەوتنم لەگەڵ ئەو لە بنکەی حیزبدا چاوم بە سەران و بەرپرسانی حیزب کەوت. هۆی تالوکە کردن بۆ ئەو کارە بەبێ لەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی ئێران و بەبێ ئەوەی لەبەرا دەوڵەتی ئێران لەو کارە ئاگادار بکرێ، لەوانم پرسیار کرد. هەموویان رایانگەیاند کە ئێمە بێ ئاگاین تەنانەت برایم احمد رەخنەی لەو کارە هەبوو. قەرار بوو لە کۆمیتەی سیاسیدا قسەی لێ بکرێ و ئەوسا لە کۆمیتەی ناوەندی حیزبدا بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەڵام تا ئەو رۆژەی من لە بنکەی حیزب بووم. مەلا مستەفا لە سازدانی کۆمیتەیەکی ئاوا و قسە و لێکۆڵینەوە لەو بارەوە بەرگری کردبوو. بەناچار چوومە ئەو شوێنەی مەلا مستەفای لێبوو، لەو بار و بابەتەوە پرسیارم لێکرد، لە وەڵامدا گوتی: ئێمە بە دژی بەرژەوەندی ئێران کارێکمان نەکردووە، لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بە دژی ئێران یەکمان نەگرتووە عبد السلام عارف و بەرپرسانی دیکەی دەوڵەت کە زۆربەیان لە دۆستان و لایەنگرانی کوردن (مەبەستی ژەنراڵ فوئاد عارف کە کورد زمان و خەڵکی سلێمانی و وەزیری دەوڵەتی (ڕاو تەگبیری عێراق بوو) ویستویانە لە بابەت ویستەکانمانەوە قسەمان لەگەڵ بکەن. مەبەستی ئێمە گەیشتن بە ویستەکانمانە ئەگەر ئەوان راست بڵێن کە هیچ کاتێکیش راستیان نەگوتووە و راستیش ناکەن چ لەوە چاکتر ئەگەر کارێکیشیان نەکرد ئێمە هەر براو هاوکار و هاویاری یەك بوین و هەین و هیچ ناکۆکێك بەدی نایێ. هەر جۆرە سەرکەوتنێکیش بەدەست بێنین بەر منەتی محەبەت و لوتفی پاشای ئێران و بەرپرسانی دەوڵەتی ئێرانین سەرەڕای ئەمانەش پێشمەرگەکانیشمان

ماندوو بوون زۆربەی ئەوان چەند ساڵە بنەماڵەی خۆیان نەدیوە بەڵکو هەلێك بەدەست بێ کە ئەوان بتوانن سەر لە ماڵ و منداڵیان بدەن و بە گیان و بیری باشترەوە ئامادەی کار و تێکۆشان بن. من بە ناچار لە راست ئەسلی مەبەستەکە و ویستەکانیان نەمتوانی دژ بوەستم بەڵام بەم بیانووە کە چۆن و چلۆن بێ ئاگادار کردنەوەی دەوڵەتی ئێران بۆ وتووێژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق رەخنەم گرت و دژ وەستام، وتم : ئەم کارە بە پێچەوانەی ئەدەب و رەوتی دۆستی و برایەتیە چونکە چ پاشای ئێران و چ بەرپرسانی دیکەی ئێران لە هەنگاودانانێکی ئاوادا ئەویش بەم جۆرە نارازی و نارەحەتن و لە نەتیجەی کارو کرداری نیگەرانن. رای گەیاند هەر بەو جۆرەی کە قورئانم ئیمزا کردووە، بە زمانیش بەڵێنی دەدەم کە هیچ کاتێ بە دژی دەوڵەتی ئێران کار نەکەم و لەم بابەتەوە ئەرخایەن بن.

من لەبەر ئەوەی کە مەبەستەکە ئاشکرا نەبێت و لە کارو بارێکدا کە لەبەر چاوم گرتووە تەنانەت لەگەڵ بەرپرسانی حیزبیش ووشەیەکم بە زارا نەهاتووە لەم بابەتەوە لە بیر و سیاسەتمدا سەبارەت بە دەوڵەتی ئێران هیچ گۆڕانێك بەدی نەهاتووە جا لەبەر ئەوەیە بە تاران رانەگەیاند. دوای قسەکانی وتم : سەرانی حیزبیش لەوە نارازین و ئاگر بەس یە بەرژەوەند نازانن. وتی: حیزب یانی من، سەرۆك یانی من، سەر و سەران یانی من، هۆز و سەرۆك هۆز یانی من، بە هەر چەشنێك هەر کەس لە شەڕدایە لەژێر فەرمانی مندایە، سەرانی حیزب هەر غەڵەتێ ئەیانەوێ با بیکەن، لەپاشان وتی : سەلام و رێزی من بە شا و بە بەرپرسانی ئێران رابگەیەنە و لە لایەن منەوە بەڵێنیان بدەرێ کە بێ بیرورا و بەرژەوەندی ئەوان کارێك ناکەم.

بێ ئەوەی باوەڕ بە قسەکانی بکەم بەجێم هێشت تەنیا شتێکی کە داوام لێ کرد، ئەوە بوو ئاکامی وتووێژی دوو هەیئەت بەهۆی سەرتیپ مەنصور بە تاران رابگەیێنێ. لە گەڕانەوەمدا بۆ بنکەی حیزب بەرپرسانم لە قسەکان ئاگادار

کرد. ئەوان لەو بارو دۆخە نارازی بوون کە پێشهاتبوو. بە تایبەت کە مەلا مستەفا سەربەخۆ بێ ئەوەی بەوان بڵێ دەستی بەو کارە کردووە. عمر دەبابە بە منی گووت: کە عبد السلام عارف ساکێکی ڕەشی پڕ لە دیناری عێراقی بە دزییەوە بۆ مەلا مستەفا ناردووە.

لە گەڕانەوەمدا بۆ تاران بەبێ ئەملا و ئەولا قسەکانم بۆ بەرپرسانی ئێران گێڕایەوە لە دواییدا کە شا بانگی کردمە لای خۆی تەواو پێم ڕاگەیاند ئەویش ووتی: لە بەرانبەر کارێکی ئاوا ئەحمەقانە کە مەلا مستەفا ئەنجامی داوە، یارمەتی و پشتیوانی لێ ببڕە.

پشتیوانی خەڵکی کورد زمان بوو کە بە دڵ و گیان یارمەتی پێشمەرگەکانیان دەدا بە دژی سوپای دوژمن، هەروەها جاش و بەشێك لەسەربازەکانی عێراق فیشەك و نارنجۆکی خۆیان بە خۆڕایی یا بە قیمەتێکی کەم دەدا بە پێشمەرگەی پارتی و حیزب. ئەمەیش خۆی لە ڕاستیدا جۆرێ چەك دارنینی دوژمن بوو. ئەرتەشی عێراقیش ئەمەی هەست پێ کردبوو کەوتبوونە چارە کردنی. بەڵام قەت نەیانتوانی ئەم گۆڕینەوە و کڕین و فرۆشە لەناو ببەن.

... لە ماوەی ١٣ ساڵ شەڕ لە نێوان شۆڕشیانی کورد و سوپای عێراق چەندە کوردی عێراقی جیا بۆوە لە ئێران — مان بۆ دابین کردنی سوود و بەرژەوەندی موڵك و میللەتی ئێران بە کوشتن داوە، کوژراو و زامدار و کەم ئەندامی سوپای عێراق و هێزە بە ناو پارتیزانەکانی عێراقی کە زیاتر لە پێشمەرگەی حیزبی دەکەوتنە مەترسی لەناوچوونی چەك و تەقەمەنی و پارە و خەرجی ڕاگرتن و پاراستنی بنەماڵە و ژن و منداڵ و کوژراوو .... هتد بێنە بەر چاو چەندە زۆرە ئەمانە گشتی سەبارەت بە دابینکردنی قازانج و بەرژەوەندی ئێمە بووە، هەر چەندە بەناو دیفاع لە سنوور و نیشتمان یا بۆ لە نێو بردنی چەتەکان بووە.

# دامەزراندنی ڕادیۆی دەنگی کوردستان

بە لێکۆڵینەوەیەك لە بەغدا بە بەشداری عیسی زەبیحی بەرپرسی شاخەی بەغدا و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزب و هەروەها یدوللا فەیلی یەکێ لە پیاوە ناسراوەکانی شاخەی بەغدا و رابیتی من ئەنجامدرا بە تێکڕا کەوتینە سەر ئەو بیرە کە بێجگە لە بەیاننامەی حیزبی کە بە نهێنی لە باکوور زۆر بە ترس و مەترسیەوە لە بەغداش بڵاو دەکرێتەوە لە باری تەبلیغاتیەوە ئەوەندەی شوێن نییە کە دڵی پێ خۆش کرێ. ناچار بووین دەستگایەکی رادیۆ لە شوێنێکی چڕ و نهێن دابمەزرێنین کە بە یارمەتی دەوڵەتی ئێران دابنرێ و بکەوێتە کار (هەر وەك ڕادیۆ نهێنیەکانی دژی کۆماری ئیسلامی ئێران کە کەس نازانێ لە کوێن !!)

بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە چوومە تاران قسەکەم بە دکتۆر پاشایی و خوالێخۆشبوو سەرلەشکر پاکرەوان راگەیاند. پاش وتووێژێکی درێژ و چەند جار کۆ بونەوە گەیشتینە نەتیجەیەکی لەبار. بڕیار درا پرس بە شا بکرێ و موافەقەتی ئەو وەربگیرێ فەرمانی دا بوو کە من خۆم بچمە کن مەلا مستەفا و سەرۆکەکانی حیزب و سەبارەت بە شوێنی دامەزراندن و بەرنامە و ئاگاداری دیکە توێژینەوە بکەم و نەتیجەی رابگەیەنم تا بڕیاری پێویست بدرێ. ئەم کارەم کرد ئەو کارەم کرد و لە ئەلفەوە تا ئاخیر قسەکەم بۆ حیزب گێڕایەوە بە تایبەت بۆ ئەوانە کە لە کاری تەبلیغاتدا شارەزا بوون و لە سازمانە تەبلیغاتەکانی عێراقدا کاریان کردبوو، بە تایبەت لەگەڵ ئەو خوێندەوارانەی کە لە ئەلمان ژیا بوون راوێژمان کرد. لە دواییدا لە لایەن شاوە هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە من بڕۆمە ئەڵمان بێ ئەوەی چاوم بە بەرپرسانی باڵوێزخانەی ئێران لە بۆن یا بەرپرسانی ساواك بکەوێ. بە هاریکاری تاکەکانی حیزب یەك دەستگا دەنگ هاوێژ "فرستنده" بکڕم و بیهێنمەوە بۆ ئێران بە کورتی بە یارمەتی

کارناسێك و نوێنەری کارخانەی سازدەری ئەم دەستگایە هاتین تا گەیشتینە سنوور، لە ماڵی کاك عەبدوڵلای جەلدیان کە یەکێ لەسەرانی هۆزی ئەو ناوە و دۆستی من بوو، ماڵێکی گەورە و لە دەوروبەری کۆشکێ دروست کردبوو، و دابووی بە براکەی دەستگاکەمان بردە ئەو ماڵە ، بۆ رۆژی دووایی بە سواری هێستر لە سنوور تێپەڕین، بەڵام ئێشمیت - ی ئەلمانی ئەندازیار و کارناسی ئەو دەستگایە، هێستر سواری نەدەزانی، هەر لە مەنزڵی یەکەمەوە خۆی لە هێستر سواری نەدەزانی، هەر لە مەنزڵی یەکەمەوە خۆی لە هێستر سواری لادا و بە پێیان ملی رێگای گرتە بەر، جا کاتێ لە بنکەی شۆڕشیەکان نزیك بوینەوە چوین یەك دوو کەسمان لەوانەی کە کاریان دەزانێ و ئەو ئەشکەوتەی کە لە سەفەری پێشودا بۆ دامەزراندنی رادیۆ لەبەر چاومان گرتبوو هەڵگرت و دەستگاکەمان بردە ئەوێ و دامانمەزراند. دیارە ئەو جێگایە لە نێو چیاو چرێکی زۆر بەرز و نهێن بوو، تەنانەت فرۆکە شەڕانیەکانی بەعسیش کاریان تێ نەدەکرد ئێشمیت کارگێرە کوردەکانی بە تەواوی فێری ئەو دەستگایە کرد.

قەرار بوو رادیۆکە بە ناوی "دەنگی کوردستان" ناو بنرێ، بەڵام چۆن خوالێخۆشبوو پاکرەوان و هەروەها شای ئێران لەبەر خاتر و زیز نەبوونی دۆستانی خۆشەویست و بە وەفای تورکمان !! بەو ناوە ڕازی نەبوون ئەوە بوو یەکەمین ووتار بە ناوی "دەنگی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق" بڵاو کرایەوە لە ئێران بە سەرتاسەری سنوور دەستوور درا تا ئاگادار بن و بزانن ئایا دەنگی ئەو رادیۆیە دەبیسرێ ؟ یا خەیر وەڵام مەبەست بوو، کاتێ گەڕامەوە بەغدا و لەبەر پرسان و رابیتی حیزبم پرسی دەنگی رادیۆکە چۆنە. وتیان تا ئەودیوی سنووری سوریە دەنگەکە دەڕوا.

# شەڕ و پێکدادانی مەلا مستەفا لەگەڵ سەرکردەکانی حیزب

ئیدارەی جاسوسی لە ئەسلدا بەباشی دەزانن کە دەست بخە ناو ڕێکخراوەکانی دامەزرا و بە تایبەت لە نێو هەیئەتی مودیرە و کۆمیتەی ناوەندی و بە گشتی دەزگای ڕێبەرایەتیدا رەخنە بکەن و بیانخەنە بەر دەستی خۆیان، دیارە ئێران وڵاتی ئێمە کە وڵاتێکی عەشیرەتییە، ساواك ویستویەتی هەمیشە لە نێو سەرۆك هۆزەکاندا ریشە داکوتێ. چونکە لە ئێران و عێراق و ئەم جۆرە وڵاتانە حیزب و حیزب بازی لە ئەفسانەیەك زیاتر نیە و ناکرێ حیسابیان لەسەر بکرێ. بەڵام من لەسەر ئەو باوەڕە بووم کە هەمیشە لەگەڵ چینی خوێندەوار و بە ئەزموون و ڕێکخەر سەروکارمان هەبێ. جا لەبەر ئەوە ئەگەر چی پارتی دیموکراتی کوردوستانی عێراق بە ناچاری دەستی نابووە ناو دەستی مەلا مستەفا و ئەوی کردبوە سەرۆکی خۆی و ئێمە بە ناچار پەیڕەویمان لە سیاسەتی ئەوان دەکرد.

سەر لەشکر پاکرەوان و سەرهەنگ پاشایی موافیقی بیروڕای من بوون، بەڵام بیروڕای شای ئێران زیاتر سەرنجی بۆلای مەلا مستەفا بوو، ئێمە لامان وابوو ڕۆژێك عەشایر و عەشایربازی تیادەچێ و خەڵك لەباری بیروڕا دەچنە پێش، جا هەر لەبەر ئەوە ئەگەر بۆ ماوەیەك لەوێ نەمێنن. شا فەرمانی داوە بۆ ماوەیەکی کورت چەکەکانیان بدەن بە سوپای ئێران لە سەردەشت بڕۆنە هەمەدان و لەوێ دامەزرێن. دەستوری پێویست بۆ ساواکی هەمەدان درا. (سەرهەنگ هۆشمەند بەرپرس بوو کە دوای شۆڕش تیرباران کرا) ڕاگەیەندرا کەئەگەر سەرکردەکانی حیزب و پێشمەرگەکانیان چەك نەکرێن، دەوڵەتی ئێران ناتوانێ بە ناوی پەنابەر وەریان بگرێ، ئەبێ لە سنووری ئێران وەدەرکەون. دوای ئەنجام دانی ئەم شتانە سەرلەشکر فروخ نیا فەرمانده‌ی هێزی کرماشان کە لە کوردستانی عێراق بوو، چوە دیداری مەلا مستەفا تا

چاکتر لە مەسەلەکە تێبگا و لە بارزانی بپرسێ کە ئەو دژایەتییە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ، هەروەها شای ئێران ڕای گەیاندووە ئەگەر دەیانەوێ هێزی باکوور کز بکەن و کەند و کۆسپ بۆ ئێمە و خۆیان بەدی بهێنن، ناتوانین یارمەتیان بدەین.
من بەم پەیامە چوومە سەردەشت، سەرلەشکر فەروخ نیا لە مهاباد بوو، پێکەوە گەڕاینەوە سەردەشت، مەحشەرێك بوو واحیدەکانی سوپای نزیك سەردەشت چوبونە نێو شار هێزی پێشمەرگەش ئەوانەی وا لەگەڵ سەرکردەکانی حیزب هاتبوون لە سەردەشت بوون، خەڵکی ئاوایيەکانی بە تایبەت ئەوانەی نزیك شار بوون بۆ تەماشا و دەربڕینی هاودەردی لەگەڵ ئەو ڕووداوەیە هاتبوونە نێو شاری سەردەشت، دەستوری شا بەوان ڕاگەیەندرا دوای قسە و باسێکی زۆر سەرکردەکانی حیزبی چەکەکانی خۆیان دانا و بە سواری کامیونی سوپایی بەرەو هەمەدان ڕەوانە کران.
دیارە گێڕانەوەی ئەم کارەساتە بە قسە ئاسانە، بەڵام بە کردەوە زۆر سەخت و دژوارە. دوای ڕۆیشتنی ئەوان شارەزاییم بە ڕێگا و بانان چوینە لای پێشمەرگەکانی مەلا مستەفا کە لە قەڵادزە بوون و لە فەرماندەی ئەوانم ویست بمبەنە لای مەلا مستەفا.
بۆ ڕۆژی دوای دەمەو ئێوارە بە سواری هێسترێ، کە تایبەت بوو بۆ سواری مەلا کە تەنیا من بووم زۆر جاران سواری ئەم هێسترە نەجیب و ئارام و قەوی و ناسیاو بە ڕێگا دەبووم. ئەمەش لوتف و محەبەتێك بوو کە حەزرەتی مەلا سەبارەت بە من دەری دەبڕی. چومە لای مەلا مستەفا و دوو بە دوو لە هەموو شتێکمان کۆڵیەوە، لە چاك و خراپی ئەو کارانەی کە کردویەتی و دەنگدانەوەیەك لە ئێران و عێراقدا هەیبووە، وتووێژمان کرد، لە وەڵامدا پەیتا پەیتا لە بابەت خراپکاری و شکێنی سەران و بەرپرسانی حیزبی قسەی دەکرد و تۆمەتێکی لەوان دەدا کە بە هیچ سرێشێکەوە بەوان نەدەلکا. دەستووری شام

پێ ڕاگەیاند کە ئەگەر هەروا بکا ناتوانێ پشتیوانی لێ بکا ووتی ئیختیار بە خۆیانە هەر جۆر کە بیانەوێ بیکەن. من کە بە پرسی ئەم کارانەم خۆم دەزانم ئەگەر بەرپرسانی ئێستای حیزب لەم هەرێمەدا بن نە تەنیا سەرناکەوین بەڵکو بەهۆی سوپای عێراق و هێزە ئامونەزەمەکانی عێراقی تەفروتونا دەکرێن. تەنیا داوای من لە شا ئەوەیە ئەوانە لەم ناوە دوور بخاتەوە و چاوە دێریان لێوە بکا تا خەیانەت نەکەن!

هەندێ پارەم کە بۆ بردبوو پێم دا و ئەویش دەیویست بە ناوی دیاری هەندێ پداتەوە بە من. منیش پێم گوت من بۆ کڕین و فرۆشتن نابم و ئەگەر جارێکی دیکە کاری وا بکەی نامبینیتەوە. لە ماوەت هاتمە پێگەی حیزب و ستادی عەمەلیاتی مەلا مستەفا هێندی کەسی دیکەی حیزبی لەوێ دانابوو. پاش چاوپێکەوتنی ئەفسەر و دەرەجەداران و دکتۆر و کەسانی دیکەی لە خۆمان بۆ ئێران گەڕامەوە لە هەمەدان چوومە ئۆردوگای میوانانی تازە هاتوو. پاش دیدارو سەرلێدان بەیەک دوو ماشین سەرۆکەکانی حیزبیم هێنا تاران. لە مزلێک: کە پێشتر بەهۆی ئاغای ئەمانی ئامادەکرابوو، پاش ڕۆیشتنی من بۆ عێراق ئەوە کرابوە بەرپرسی کاروباری کوردەکان. نیشتەجێکران. ڕاپۆرتی درێژی کارەکانم دا بەپاکرەوان و بۆ بەغدا گەڕامەوە.

... چەند جار چوومە باکوری عێراق بۆ ئەوەی مەلا مستەفا رازی بکەم تا سەرکردەکانی حیزب و ئەو چەند پێشمەرگەی وا لەگەڵیان هاتبونە ئێران بگەڕێنەوە باکوری عێراق. سەرهەنگ منصور نوێنەری ساواک ماندوو ببوو، کارێکی لەدەست نەدەهات. ئەوە بوو سەرلەشکر مودەریسی یەکێ لە ئەفسەرانی کوردزمان و خوێندەوار کە لەبنەماڵەیەکی دیندار بو، کرایە جێنشینی ئەو، ئەم ئەفسەرە بوو کە مەلا مستەفا ئیجازەی دا تا سەرکردەکانی حیزبی و ئەو پێشمەرگانەی وا لەگەڵیدا هاتبوون بۆ ئێران و لە هەمەدان دانرابوون بگەڕێنەوە، مەلا مستەفا لەو دیارەدا بۆ گەڕانەوەی ئەوان بەناوی دیار کالیبر ١٤!

یا بەقەولی کوردەکان براویزنگ ١٤خۆری) بە من دا. منیش وەرم گرت و گوتم سوپاست دەکەم، من دیاری وا وەردەگرم کە بۆ ئەفسەران شیاوە، نەك پارەو دراو. پاش گەڕانەوەم چوومە لای شا، دوای گێڕانەوەی کارەساتەکان بە شام وت مەلا مستەفا تەمای وەبەر دەنام و پارەی دەدامێ، لێم وەرنەگرت، بەڵام جاری سێیەم کالیبر١٤حیەکی پێدام لێم وەرگرت. منیش لە سپام داواکرد تا دەمانچەیەکی جوانم بۆ بکڕێ، تا منیش وەك دیاری بیدەم بە مەلا مستەفا. ئەو کارەم کرد تا بزانێ ئەفسەران ناکڕدرێن. شا زۆری بەکەیفێ بوو، پەیتا پەیتا سەری دەلەقاند کە نیشانی بدا باشە.

دەوڵەتی بەعسی عێراق باشاری پێشمەرگەی کوردی بۆ نەدەکرا. جا بەناچاری پەنای بە وڵاتانی عەرەبی یا ئەوروپایی دەبرد کە زەخت بخەنە سەر دەوڵەتی ئێران تا دەست لە پشتیوانی کورد هەڵبگرێ و دۆستانە کەندو کۆسپی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی بەعسی عێراق لەنێو بەرێ. بەڵام چونکە ساواك لەکارو کردەوەی نهێنی و پشتی پەردە زۆر ئاگادار نەبوو، بەس دەیزانی کە عێراق بۆ کەڵك وەرگرتن لەدەرفەت دەیەوێ لەگەڵ ئێران وتوێژ بکا تا لەهەلی خۆیدا زەربە لەئێران بدا، ئەوان پێوەندی ئێمەیان لەگەڵ کورد بەدرۆ دادەنا. دەبێ ئەوەش بڵێم کە بەداخەوە عێراق لە ساواك دا نفوزی پەیدا کرد بوو. لە کات و زەمانێکی گونجاودا دەستی کرد بە گرتن و بەند کردنی ئێرانیەکان و کوردەکانی دانیشوی بەغدا. سێ کەس کە کاربەدەستانی باڵوێزخانەکە مەسونیەتی سیاسیشیان هەبوو گیران. چەك و بەڵگەنامە و پارە و شتی تر کە وەدەستیان کەوتبوو، خستیانە بەرچاوی خەڵك و دەستیان کرد بە چاوڕاو داخستن بە دژی ئێران. بەختیاریشیان بانگ کردە عێراق تا بنکەی پارتیزانی دامەزرێنێ بۆ روخاندنی رژێمی پاشا، ئەویش هاتە بەغدا و دەستی بەکار کرد بەڵام لە سەعدیەی سەر بە ناوچەی خانەقین کوژرا و سەری لەو رێگایەدا دانا. دەبێ بڵێم بەختیار لە رێگای سەفەر بۆ سویس لە لوبنان گیرا و قەرار بوو

بلرێتەوە بە ئێران بەڵام بە هۆی ژەنەراڵ شەهاب سەرکۆماری ئەو سەردەمەی لوبنان و قەشەیەك کە دۆستی تەیمور بەختیار بوو، ئازاد کرا و چووە عێراق تا کارێ بکا رژێمی شای ئێران لەناو بەرێ.

کاری چاپ و لەچاپدانی بەیاننامەی حیزب لە بەغدا بۆ ئەندامانی حیزب زۆر سەخت و نەگونجاو بوو، بە تایبەت بلاوکردنەوەشی لەوە چەتونتر بوو. بە ناچاری بەیاننامەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقم بە هۆی رابیتەی دەبرد و ماشێن تایپمان دەکرد و شەوانە بە ئوتومبێلی عادی دەمان نارده شوێنی ناوەندەکان لە بەغداو دەوروبەری. هەمیشە لەوە دەترساین کە ئەگەر بگیردرایەن کەندو کۆسپێکی زلی بۆ پێك دێناین.

لەسەفەرێکدا بۆ تاران کە سەرلەشکر پاکرەوان سەرۆکی ساواك بوو لەو سەردەمەی کە تازە نێوانی مەلا مستەفا تێکچوو بوو لەگەڵ سەرکردەکانی حیزب لە تاران بوون، پاکرەوان لێبرا بچێتە ناوچە و چاوی بە مەلا مستەفا بکەوێ. داوای لە من کرد تا لەو بابەتەوە بکۆڵمەوە و لە تاران تاکو ئەوێ و تا گەرانەوە باش بیدەمە بەر سەرنج. منیش دوای لێکۆڵینەوەی پێداویست، شتەکەم پێ راگەیاند و ئەو رۆژە چوبوە لای شا و ئێوارێ تەلەفونی بۆ کردم کە شا رازی نییە برۆین و هۆی سەفەر پێك بێنە. چومە لای مەلا مستەفا لە حاجی عومەران و باسەکەم پێ راگەیاند زۆری پێ خۆش بوو بەڵێندرا تا پێشمەرگەکان لە سەعات ٩ لەنێوان پاسگای کێلەشین و حاجی عومەران بن ئێمە رێنوێنی بکەن.

پاکرەوان لە تاران بۆ تەورێز و لەوێوە بۆ ورمێ و لەوێشەوە بێ راوەستان بۆ خانێ هات. بەشەو چوینە پاسگای کێلەشین کە بەهۆی بۆمبارانی بەعسیەکانەوە لە غەوارە چۆڵ بوو. لەوێ جلکی کوردیمان لەبەر کرد لەگەڵ پاکرەوان چوینە سنووری عێراق و چەند پێشمەرگە بە ماشێنی جێب چاوەڕوانمان بوون، لەبەر قوڕ و نالەباری رێگا، ماشێنەکان دەرنەچوون و

بەناچار بە پێیان ملی ڕێگەمان گرتە بەر تا چوینە ئەو شوێنەی مەلا ستەفای لێبوو. فراونیمان لای مەلا خوارد و زۆرمان پێکەوە قسە کرد. لە پاشان هەستاین مەلا مستەفا تا ئەو شوێنەی ماشێنەکانمان بەجێ هێشتبوو بەرێ کردین، دواییە چەند پێشمەرگە تا بەردەم پاسگای کێلەشین لەگەڵمان هاتن¹.

جارێکی دیکە لە تاران کە قسەم لەگەڵ یارمەتی دەری ئاگاداری وەزارەتی دەرەوەی ساواك دەکرد، تێگەیشتم کە دوو وڵاتی ئەمریکا و ئیسرائیل لە پێوەندی و هاریکاری ئێمە لەگەڵ کوردان ئاگادار بوون، هۆی ئەوەم پرسی لە وەڵامدا وتی شا دەزانێ و ئێمە دەسەڵاتێکی وامان نییە. تەنانەت بۆم دەرکەوت کە ئەمریکا لە بابەت پارەوە یارمەتیدانێك: ئەکات یارمەتیدەری دەرەوەی ساواك ووتی: دەستوریان داوە کە چوار کەس، یان سەرۆکی ستادی سپای ئیسرائیل، ئاجودانەکەی سەرۆکی روکێ دوو و سەرۆکی رونکی سێی عەمەلیاتی ئەوان لەگەڵ خۆت بەریە لای مەلا مستەفا تا چاویان پێ بکەوێت. پرسیم کێ ئەو دەستوورەی داوە. وتی بێجگە لە شا کێ دەتوانێ دەستوری وا بدات. وتم ئەمە باش نیە سۆزی خەڵك پێ بزانن دەکەوینە بەر هێرشی چاوەڕوانی وێرانکەری ناسر و وڵاتە عەرەبیەکانی دیکە، بڕوام بە سەفەرێکی ئاوا نیە. لەو کاتەدا دەرگا کراوە و فەرمان درا کە میوانەکانی هەندەران ئەمانەن. چوار کەس درێژ و کورتە باڵا هاتنە ژورێ و یارمەتیدەری دەرەوەی ساواك ئێمەی بە یەك ناساند. ئاجودانەکە ئەفسەرێك بوو تابعی ئەڵمان و چەند جار پێکەوە چوبوینە خوزستان. دووبارە رامگەیاند ئەم سەفەرە بەباش نازانم و چومە لای سەرۆکی ساواك، پێیان ووتم تۆ بەڕێوەبەری فەرمانی برۆ کارەکەت بکە، بە ناچار خۆمان

¹ نووسەر هەرچەندە لەوورپایدا شوری لێ هەڵکێشاوە و کەسی لەخۆی ژیرتر نەهێشتۆتەوە، بەڵام چونکە ئێستاش هەر ساواکی ماوەتەوە و ساواکی بیر دەکاتەوە، ڕێگا و ڕێبازی ناوچەکانی کوردستانی لێ تێکچووە، پاسگای کێلەشین کەوتۆتە سەرووی شنۆ و لە خانێ و حاجی عومەران دوورە.

ساز کرد ئەوان بە فرۆکەی ئێرتاکسی لە فرۆکە خانەی خانێ (پیرانشار) دابەزێن و خەبەریشم بە تەلەگراف بە مەلا مستەفای بارزانی دابوو، لە خانێ بێ وەستان چوینە پاسگای کێلەشین، هەر بەو جۆرەی پاکردوانم بردبوو ئەمانەشم بردو هێنامەوە تاران مەلا مستەفا زۆر خۆشحاڵ بوو لەبەر خۆشیان نەیدەزانی چی بکات لانی کەم تا سێ کیلۆمەتر هاتبوە پێشوازمان بە لانەی کەمەوە هەزار پێشمەرگە لەو مەڵبەندی ئامادە کرا بوون.

ماوەیەك رابردوو کە هەواڵم زانی کە ئیسرائیلیەکان دۆستانی ئازیزمان پێشنیاری کردووە تا چەند کەس کە فارسی و عەرەبی و کوردی بزانن لەگەڵ دار و دەستەی ئێمە با لە مەڵبەندی کوردستانی باشوور جێگیربن، بەڵێ : جێگای سەرنجە ئەوەی ئێمە ساڵەهای ساڵە لە بابەت چەك و پێداویستی شەڕ، خواردەمەنی، پارە، دراو گشت ئەو کەرەستەی زەوینی و هەواییانەی کە دابینمان کردبوو، رەنجمان بۆ کێشا بوو تا سەرکەوین و خۆشەویستی ئێران ببەینە نێو کورد، کارێ بکەین تەنیا هیوایان بە ئێران و دەوڵەتی ئێران هەبێ ئێستا کەسانی دیکە کە هیچ زەحمەتێکیان نەکێشاوە و ئاگایان لە کار و بەرنامەیەکی وەها نەبووە بێن و بەرهەمی ئەوە بەناوی فێکردن و .... هتد وەرگرن و بیکەنە هونەری خۆیان و خۆیان کەلکی لێ وەربگرن.

ئەوە شوێنێکی زۆر خراپی لەسەر کورد دادەنا کە بۆ قسە لێ کردن نابێ، کردیان ئەوەی ویستیان ئەوەی دەبوو بەسەر ئێمە بێ هات ئێمە ئیتر ئەوەندەمان بایەخ لە لای کوردەکان نەمابوو. شۆڕش و راپەڕین بەهۆی ئێمەوە ساز درا، پارە و دراوەکەشی ئەمریکاییەکان نەیدەن، فێرکردن و رێنوێنیش کەوتە دەست ئیسرائیلیەکان نەی ئێمە چ کارەین؟ هیچ لەگەڵ ئەتەشبود نەسیری باسەکەم هێنا گۆڕێ. ئەوەی پێویست بوو پێم راگەیاند وتم ئیزنم بدە تا بڕۆم بەم کار و بارە رابگەم. بە مەلا مستەفا و ئەوانی دیکە حاڵی بکەم ئەو جۆرەی کە بیری لێ ئەکەنەوە، وا نییە و ئەمە قاوێکە، کە بنەڕەتی بۆ نییە و کە دوژمنانی هەردوو

پێلاوی دەکەنەوە. ئەبێ بە گشتت هێزەوە بەرگری لێوە بکرێ. ئەو کارەم کردو دەستکەوتی باشم لێ وەرگرت. لەبەر زۆر مەسایلی حەساسی دیکە کە دەبێ هەر بەردەوام بێ ولە روانگەی بەرژەوەندی و خۆپاراستن باسیان ناکەم تا دەرفەتێکی دیکە.

## پێوەندی لەگەڵ روس و خیانەت بە قورئان

دژایەتی لە نێوان مەلا مستەفا و سەرکردەکانی حیزب ببوە هۆی لەت بوونی هێزی پێشمەرگەکان. مەلا لەبەر خۆ بە زل زانی و ئێرەیی و دیکتاتۆری و تەك رەوی، لەناو شۆرشیەکاندا لایەنگرێکی ئەوتۆی نەبوو، تەنیا ژمارەیەك پێشمەرگەی بارزانی و چەند کەس لەوانەی لە بەغدا و شارەکانی دیکە رایان کردبوو کە حیزبیش لە دەوری مەلا مستەفا کۆ ببونەوە پارە و دراو بە دەست ئەو بوو، نێو نیشان هی ئەو بوو، ووزە و هێز لە دەست ئەودا بوو بەم جۆرەش خەنەکەی بێ رەنگ بوو بە پێنج سەد شەش سەد کەس لە پێشمەرگەی تایبەت بە خۆی ئەوانەی لە بن فەرمانی ئەودا بوون، چاك پێیان رادەگەیشت پێشمەرگە حیزبیەکان بە نێوی جۆرا و جۆر لە نێو هێزی تایبەت بەو نفوزیان کردبوو. بەم هۆیەوە رابەلکەی ئاگاداری ئەوان بە هێز ببوو، لە چکۆلەترین کار و تێکۆشانی مەلا ئاگادار دەبوون. جارێك باوەڕیان پێ کردبوو ئەویش وەڵامی ئەوانی بە وتووێژی نهێنی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و ئاگربەس دابووە ئیتر نەیاندەویست لەوە زیاتر فریو بخۆن.

ئەفسەران و دەرەجەدارانی نێردراوی ئێمەش بۆ عێراق لەو هەلە کەلکیان وەرگرت، سەرەڕای ئاگاداری و نامەی پێوەندی دار بە عەمەلیاتی شەڕ، لە مەڵبەندە جیاجیاکان کە هەموو رۆژێ بە سەرپەرشت و نوێنەری ساواك

رادەگەیاند لە کارو باری نێوخۆی مەلا و حیزبیش جوان ئاگادار دەبوین، منیش لە بەغدا لە عیسا زەبیحی و یەدوللا فەیلی و لە کارو باری کوردان و چ لە کارو باری نێو عێراق ئەوپەڕی کەلکم وەردەگرت. ئەو دوو کەسە لە ڕابەرانی شاخەی بەغدا بوون، نە تەنیا لە نێو کوردی حیزبی بەڵکو لە نێو نەتەوەی کوردیش ناسیاو لە خوێندەواران بوون و لە نێو هەرسێ هێزی دەوڵەتی لە یانە و دام و دەزگاکاندا دۆستانی زۆریان هەبوو لەم ڕوانگەیەوە بە سەرنجدان بە گەلاڵەی ئاگاداری بنەڕەتی یا ڕۆژانە لە مەسەلەی جیاجیای عێراق بە تاقم و ڕێکخراوەیەك بەهۆی ئەوانەوە ناسیاویم پەیدا دەکرد و کەڵکی لێ وەردەگیرا، تەنانەت بە شێوەی لەبار نفوزمان کردبوە نێو ڕێکخراوی جاسوسی عێراق، بۆ وێنە من بۆ دیدار لەگەڵ حەردان تکریتی کە لە سەردەمی عبد السلام عارف لەو ئەفسەرە بەعسیانە بوو کە ڕای کردبوو چوومە لەندەن و لەوێوە بۆ سویس دوای چاوپێکەوتن و ووتوێژ چوومە تاران و دووای هەواڵدنی ئەوە بە سەرۆکی ساواك و ڕاگەیاندنی بە شای ئێران چومەوە بەغدا لە بەغدا هەواڵم زانی کە عبد السلام عارف دەستوری لە بن چاوگرتنی منی داوە دیارە ئەمە بۆ هەر ساواکیەك وەك من مەسەلەیەکی گرنگ بوو کە چلۆن سەر کۆمار فەرمانی کاری وەهای داوە کاتێ جوان چوومە بنج و بناوان لە مەسەلەکەم کۆڵیەوە تێگەیشتم تا حەردان تکریتی، هەرچەند بەعسیە بەڵام لەگەڵ عبد السلام عارف پێوەندی هەیە. لە ڕاستیدا هەم بە ئێمە و هەم بە حیزبەکەی خۆی خەیانەتی کردووە. دوای چەند ساڵ بەعسیەکان لە ساڵی ١٩٦٨ دا کودیتایان کردو کاروباری عێراقیان گرتە دەست. حەردان تکریتی بۆ عێراق گەڕایەوە. جگە لە فەرماندەیی هێزی هەوایی، هاوکات یارمەتیدەری سەرۆك وەزیرانیشی گرتە دەست. ئەم بەعسیانەی حاکم لە عێراقدا سەرئەنجام پەیان بە خەیانەتی ئەو برد. بەر لە گرتنی هەڵات و ماوەیەك لە ئەورووپا دوایی چووە کومیت. بەعسیەکان ئەویان دۆزیەوە و نایانە ناو جەعبەیەك و بە نێوی کەرەستەی

دیبلۆماتی قایمیان کرد کە لە گەڕان تەرخان بوو، بە فرۆکە ناربیانەوە عێراق و کوشتیان. رابیتی حیزب هاتە لام و گوتی: چەند بارزانیمان لە بەغدا دیوە کە ژنەکانیان روسین و خۆیان پێشمەرگەن و لەبەرەی شەڕدان. دوای چاوەڕوانیێکی سەرنج راکێش، حاڵی بوین کە ژنی رووسی یەکێك لەوانە چاوی بە ئەندامێکی بالوێزخانەی رووسیە لە بەغدا کەوتووە. پێشمەرگەیەکی حیزبی کە لە باکور بووە چاوی بەو ژنە کەوتووە کە ناسیاو بوون و تێگەییوە کە هەموو مانگێ جارێك لە بەغدا دەچێتە بالۆێزخانەو پارەیەك وەردەگرێ و بە هۆی مێردەکەیەوە، دەیدا بە مەلا مستەفا. منیش پێم سەیر بوو، کەوتمە جوڵە جوڵ و پرسیار و لێکۆڵینەوە تا بزانم ئەم قسانە لە دوژمنی کردن لەگەڵ مەلا مستەفا دەگرێ یا راستیەکی بۆ هەیە و بە راستی و ناراستی ئەو کەسە بزانم.

بە سوێندەوە نوسا کە ئەو قسە راستە. گوتم جارێکی دیکە باش لێی بکۆڵەوە و خەبەرەکەم بدەوە. دوای بیست رۆژی دیکە هاتە لام و زۆر سوور لەسەر ئەو قسە رۆیی و گوتی: راستی راستە. زۆر نارەحەت بووم و وتم من لەکاتی خۆیدا بە شام ووتووە کە مەلا مستەفا بە هیچ جۆرێك جێ بڕواو و دڵنیای نیە، بەلام بۆ کەڵك وەرگرتن دەبێ دوای ئەوەی هەوڵەکەم بە پاکرەوان راگەیاند کە ئەویش بە شای رابگەیەنێ، چومە باکور و چاوم بە مەلا مستەفا کەوت و قسەکەم پێ راگەیاند، ئەویش لە وەلامدا ووتی چەند پێشمەرگە کە ژنەکانیان روسن و لەبەر ئەوەی کە پۆست کار ناکا، خزم و کەسیان هەندێ پارەیان بۆ دەنێرنە بالۆێزخانە یەکێ لەم ژنانە دەچێ و پارەکەی وەردەگرێ ئیتر شتێکی دیکە لە گۆڕدا نیە جا نازانم چۆن سوێندی بە درۆ خوارد، بەلام دەزانم کە بە سزای خۆی گەی و بە سەرەتانی خوێن تیا چوو.

# له دەرەوە و له نێو کاردا

هەروەك له بەرا ڕامگەیاند کاروبارەکەی باکوورم ئەسپاردە دەست غەیرە نیزامیەکی لیسانسییەی قەزانی کە جێگای سەرنجی مدیری گشتی ئیدارەی دووەمی جاسوسی ساواك، منیش له تاران بومە سەرۆکی ئیدارەی دەرەوەی سنوور له هەمان ئیدارەی ئاگاداری دەرەوەدا. جا دووای ئەوەی مەلا مستەفا سەرانی حیزبی دەرکرد و له هەمەدان ئاوا رە بوون، ئیتر هیچ کەس نەیدەتوانی بڵی لەل، زۆر بە دیکتاتۆری حکومەتی دەکرد. سەر لەشکر مدرس نوێنەری ساواك لای بارزانی بوو، ئەفسەرێکی هێدی و هێمن و مەتین بە ئەدەب بوو. له راست ویستەکانی مەلادا هیچی پێ نەدەکرا و ناچار ئەوانی بە تاران رادەگەیاند. پیاوی ئیسرائیلی وەك مێروله و کولله دەوریان دا بوو. لەسەر هەرچی بێ رووی خۆشی نەدەدا بە من. باش ئەیزانی کە من ئەو باش دەناسم. خاڵی بەهێز و لاوازی ئەو له خۆی باشتر دەزانم، بۆ داهاتوو، و دابین کردنی بەرژەوەندی و مەصلەحەتی وڵاتم، سەبارەت بە سەرۆکەکانی حیزبی و ڕوانگەیەکی لەبارم هەبوو. لام وا بوو له ئاخردا ئەوانە دەبنە میرات گێری راستەقینەی کوردەکانی عێراق و له ڕێگەی ئەوانەوە دەکرێ دەست بخرێتە ناو کوردەکانی دانیشتوی وڵاتەکانی دیکەش. زووربەی ئەوانە ناوبانگی جیهانیان هەبوو. من خاڵە کزەکانی ئەوم دەناسی و لەگەڵ ئەودا نەبووم. من لایەنگری حیزبیەکان بووم، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی و سوودی وڵاتەکەم بپارێزم. لام وابوو ئەوانە میراتگری بە راستی کوردن له عێراقدا و له ڕێگەی ئەوانەوە ئەتوانرێ رەخنە بکرێتە نێو کوردەکانی دیکە. زووربەی ئەوانە کەسایەتیەکی نێو نەتەوەییان هەبوو[1].

---

[1] بەژمان بە راشکاوی پەردە لەسەر نەخشەی ساواك لادەدا و دەڵێ: . له ڕێگای سەرۆکەکانی حیزبەوە( واتە مەکتەبی سیاسی کۆن) دەکرێ دەست بخرێتە نێو کوردەکانی وڵاتانی دیکەش و بە قازانجی دەوڵەتی ئێران لارێ بکرێن.

**ڕۆژێك كاتژمێری نۆی شەو پاكرەوان تەلەفونی بۆ كردم و چوومە لای ووتی: شا لە كارو باری باكوری عێراق ئەوەندە نیگەران نیە.**

**بەڵام لە بزوتنەوەی ئێرانیەكانی هەڵاتوو بۆ ئەودیو دەترسێ. ئینجا تۆ دەبێ خەریكی كۆكردنەوەی هەواڵ بێ. یەكەم، ڕاگرتن و پاراستنی پێوەندی خۆت لەگەڵ سەرۆكەكانی حیزبی. دووەم، ئاگاداری لە تێكۆشانی نێو خۆی عێراق لە بارەی تەیموری بەختیار و هەڵسوڕانی ئەو. سێیەم، پێوەندی لەگەڵ كوردە پەنابەرەكانی عێراقی لە ئێراندا و نابێ هیچ كەس لە ساواك بەم كارەی تۆ بزانێ. ڕاپۆرتەكان بە دەستی بنووسە و بیاندە بە من تا بیانگەیەنم بە شا حكومەتی بەعسی عێراق بۆ پوچ كردنەوەی توانا و نفوزی ئێران لەسەروی عێراق و لە نێو كوردەكانی شۆڕش دەستیان لە هیچ كارێك نەگێڕاوە. ڕۆژ بە ڕۆژ هێزی زیاتریان بۆ سەرووی عێراق دەنارد. لە چەكی مۆدێرن كە رووسەكان دابویان بە ئەرتەشی عێراق بۆ سەركوت كردنی پێشمەرگە كەڵكیان وەردەگرت. میكی( ١٨ و ٢١ ) فرۆكەی تۆپۆلۆف تەنگیان بە كوردەكان هەڵچنی بوو. دەوڵەتی ئێران بڕیارەكانی پێشوو كە دەبوایە تەنیا چەكی سووك بدات بە كوردەكان بە ناچاری لە بەرانبەر پەلاماری فرۆكەی دوور فڕ، چەكی دژی هەوایی و تۆپی ٧٥ ی چیایی كە لە هێستر بار دەكران و لە قور خانەی. ئەرتەشی ئێران وەلانرابوو، خستیە دەستی پێشمەرگەكان. فرۆكەی ئێرانیش جار و بار بۆ پەلاماری ئامانجی تایبەتی هاوكاریان دەكرد.**

**لە هەواڵەكانمدا پێشنیارم كردبوو كە بەهۆی فرۆكەكانی سپایی جلك و خواردەمەنی و شتانی پێداویست بۆ باكوور بەرێ بكرێت، هەرچەند فرۆكە شەڕانیەكانی بەعس ماوەیان نەدەدا.**

**شۆرای شۆڕشی عێراق بە ڕاسپاردەی احمد حسن البكر و كارگەردانی صدام حسین بڕیاری دا دەرگای وتووێژ لەگەڵ مەلا مستەفا بكاتەوە دەست بە هاتوچۆ كرا. هەیئەتێك بە نهێنی بۆ سەروی عێراق ناردرا. لەگەل مە لا**

مستەفا وتووێژیان دەست پێ کرد و وادەیان پێدا کە ئەوەی پێویست بێ بۆ ڕاگەیاندنی شەڕ وەستان و لە کۆتاییدا ڕاگرتنی شەڕی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق ئەنجام بدەن. مەبەستی دەوڵەتی عێراق ئەوە بوو کە هەرچۆنێك بێت تەنانەت بە دانی خۆت موختاریش بە کوردەکانی عێراق خۆ لەم بەلایە دەرباز بکات و ببێتە هۆی هاندان و هاروژاندنی کوردەکانی ئێرانی دژی دەوڵەتی ئێران. لە کاتی گەیشتن بەم ئاکادەمە دەیانتوانی دەست پێشخەری لە دەست دەوڵەتی ئێران بێتە دەر و ببێتە هۆی ئاژاوە و نا ئارامی لە ناوچەی کوردستانی ئێراندا. بەلاّم مەلا مستەفا نەیدەویست دەست لەم سفرە ڕەنگین و پڕ بەرەکەتەی دەوڵەتی ئێران هەڵ بگرێ. بۆیە بیانوی دەهێنایەوە و نەیدەویست وتووێژ بە ئەنجام بگات. چونکە ئەگەر خودموختاری درا بە کوردستانی عێراق جەنابی مەلا چ کارە دەبوو؟ هیچ ! بە بڕوای من دەبوو بچێتەوە گوندی بارزان و لە پەنا شێخ احمدی برای بێکار بایە.

نوکتە: بۆ زانین دەبێ ئەوەی بڵێم کە مەلا مستەفا خۆی قەت لە هیچ شەڕێکدا بەشداری نەکردووە، مەگەر بە هەلکەوت بۆ ڕاو فیشەکێکی تەقاند بێت. سەوادیش نەبوو، لە بنەمای ئیداری و سیاسی زۆر بێ خەبەر و نائاگا بوو بە کەسێکی وا کە لە باکوردا ئیمتحانی خۆی بە کوردەکان دابوو چ کارێکت دەتوانی بەو بسپێری.

بە هەر چەشنێك بێت حیزبی بەعس لە عێراقدا بە یارمەتی دەوڵەتانی بێگانە( ناویان نا بەم چونکە ئێستاش هەر نهێنییە!! ) کە دەسەلاّت بەسەر عێراقدا هەیە، دەبێ بە هەر شێوەیەك کە بلوێ مەسەلەی باکوری عێراق چارەسەر بکرێ. ئەوەش ڕاست لە جەنگەی شەڕی هەردوولادا بوو کە لە باکوور ڕۆژانە سەدەها کەس لە سپای عێراق و چەند کەس لە شۆڕشیەکان دەکوژران. زەرەر و زیانی دەوڵەتی ئێرانیش لە بابەت چەك و دابین کردنی پێداویستیەکانی هەزاران پێشمەرگە، سەرنج ڕاکێش بوو. هەرچەند وتووێژی

نێوان دەوڵەتی عێراق و مەلا مستەفا درێژەی دەکێشا ئەژمارەی هەردوو لا زیادیان دەکرد و لە لایەن مەلا مستەفا وە گیر و گرفتی تازە پەیدا دەبوو. بەعسیەکان ناچار بوون واز لە وتووێژ بێنن و بگەڕێنەوە بۆ بەغدا. هەیئەتی ناردراو بە شۆرای شۆڕشی ڕاگەیاند کە ئاستەنگی سەرەکی لە چارەسەر کردنی مەسەلەی شیمال مەلا مستەفایە. دەنا سەرۆکانی حیزبی بەوە ڕازین کە دەوڵەت داویەتی. ئەنجامی مادەی ٣ی بەیاننامەی شۆڕش بەیاننامەی ژمارە ١ی شۆڕشی ٥٨ لەگەڵ ئاوەدانکردنەوە و ماڵی خەسارەت بە بنەماڵەی ماڵ وێران و یا کەس کوژرا و دروست کردنی مەدرەسە و بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچە لە لایەن ئەوانەوە ویستی سەرەکی ئەوانە و پێی ڕازین. بەڵام مەلا مستەفا پێ دادەگرێ کە دەبێ دەستەبەرێك هەبێ تا شەڕ بوەستێنێ. مەلا مستەفا بە چەند کەسی وتبوو کە بەعسی درۆ دەکەن، دەیانەوێ دەرفەت بێنن تا خۆیان بە هێزتر دەکەن و هەموو کوردستان وێران ئەکەن. من بڕوایان پێ ناکەم تا دەوڵەتێکی وەك ئەمریکا، سۆڤیەت، فەرەنسا و یان ئینگلیز دەستەبەر نەبێ لەوانەیە، ئەو دەم حەقی خۆی بووە وا بیر بکاتەوە. چونکە بە تەجروبە دەرکەوت کە قەراردادی نێو نەتەوەیی کە لە نەتەوە یەکگرتووەکان تۆمار کرا بوو خستیە ژێر پێی دراندی.

# بیر و گەلاڵەی تازەی بەعسیەکان

بەعسیە حاکمەکانی عێراق دڵنیا بوون کە لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە سەرپشکی وەدەست ناهێنن. لە وتووێژی درێژ و بەردەوام لەگەڵ بەرپرسەکانی حیزبی بە نهێنی و بە ناوی دەستەی نوێنەرایەتی بۆ سەرووی عێراق بۆ وتووێژ لەگەل مەلا مستەفا گەیشتنە ئاکام. ئەوەی لە توانایاندا هەبوو سەبارەت بە بەهێزکردنی لەشکری شەرکەریان لە شیمال لە بواری نەفەرات و چەك و قورخانە و شێوەی جیاوازی شەرکردنیان و هەنگاویان بۆ هاویشت، لە هیچ بارێکەوە سەرنەکەوتن.

شورای شۆڕش بە رێبەرایەتی احمد حسن البکر و صدام حسین وەك یارمەتیدەری سەرکۆمار، خودموختاری کوردستانی عێراقیان پەسەند کردوو ئامادەبونی دەوڵەتی عێراقیان بۆ بەرێوەبردنی بڕیاری پەسەند کراو و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و فێر کردن و بار هێنان و ... هتد. راگەیاند لە گشت کوردەکانیان داوا کرد تا بۆ سەرخستنی ئەو بەرنامانە لەگەڵ حکومەت هاریکاری بکەن. بە گوێرەی بڕیاری شورای بەرزی شۆڕش، تەواوی کارەکانی سەرووی عێراق لە بواری سیاسی و ئیداری و ئابووری و پەروەردە و کلتوری و ئاوەدانی و پێوەندیەکانی لە ماوەی پێنج ساڵدا ئەنجام دەدرێن و کوردەکان دەبنە خاوەن دەسەڵات بەسەر چارەنوسی خۆیاندا.

زۆر بە لەز دەستی کرد بۆ ئەنجام دانی ئەو بەڵێنیانە، هەرچەند ئەم کارانە شوێنی گرنگی لە نێو کوردەکانی بن دەستی ئێران، تورکیا و سوریا دانا، هەرچەند ئەم سێ دەوڵەتە زۆر بە توندی و ووشیاری ئاگایان لە کوردەکانی بن دەستی خۆیان بوو، کەچی نائارامی و ئاژاوە بە نهێنی لەو سێ وڵاتەدا دەستی پێ کرد. بەڵام بەهۆی دەوڵەتەکانەوە سەرکوت دەکران.

پروپاگەندە دژی ئێران زۆر توند و تیژ ئەبوو. بەهۆی رادیۆ لە بەشی کوردی رادیۆی عێراق، کوردەکانی ئێرانیان بە نا فەرمانی و شۆڕش دژی دەوڵەتی ئێران دنە دەدران تا زیاتر راپەڕن.

جارێکی دیکە بەهۆی فەردوستەوە منیان بردە لای شا و ئەویش دەستوری دا زۆر بە نهێنی بڕۆمە لای برایم احمد و جلال تاڵەبانی و عمر دەبابە و پێیان بڵێم با مەسەلەی ناکۆکی و نا تەبایی لەگەڵ مەلا مستەفا لە بیر بەرنەوە و لەوە زیاتر دژایەتی نەکەن. ئەوەی بۆ تەبلیغات لە رادیۆ یا بلاّو کردنەوەی بەیاننامە لە هەرێمی جیاجیای باکوری عێراق یان بەغدا پێداویستیان پێی هەیە، داوای بکەن تا بیان دەینێ. ئەگەر تا ئێستا پارەی تایبەتی شۆڕش بە مەلا مستەفا دراوە، لەمەو دوا بە جیا پارە بۆ تەبلیغاتی پتر و بەهێز بوونی رۆحیەی پێشمەرگەی حیزبی بەهۆی مرۆڤێکی بڕوا پێکرا و بۆ حیزب رەوانە دەکرێ و پێتان دەدرێ. منیش دوایی چونم بۆ باکور و ئاخاوتن لەگەڵ سەرانی حیزب، نوری احمد تەها سەروانی پێشوی ئەرتەشی عێراقم دیت کە یەکێ لە بەرپرسانی حیزب بوو. ئەوم لەگەڵ خۆم بۆ تاران هێنا، نەخۆشیش بوو، دامە دەست دکتۆرێك تا بە نەخۆشیەکەی را بگا و ئاگای لێ بێت. منیش هەموو مانگێك پارەیەك کە لە هوویدا (سەرۆك وەزیری ئەو کات. م. ) وەردەگرت، بەوم دەدا و ئەویش دەیبردەوە بۆ باکوری عێراق.

# ئەسپاردنی کار لە شارەوانی گشتی وڵاتدا

رۆژێك وەزیرێکی پێشووی کورد زمانی عێراقی هاتە تاران و لە هوتێل هیلتۆن میوان بوو، مرۆڤێکی شیاوو لە سیاسەتمەدارانی بەناوبانگ و ناسیاوی عێراق بوو، بردمە لای شا، لەپاشان شا وتی بچۆ لای فەردوست،چوومە لای فردوست منی ناردەوە لای شا، شا وتی بۆ ئەوەی راحەت و ئازادتر بە کارەکانت رابگەی لە شارەوانی گشتی وڵات ببە بە سەرۆکی ئیدارەی ئیتلاعات (مەبەست یانەی جاسوسیە. و. ) تا باشتر بتوانی ئەو ئیدارە بخەیتەوە گەڕ، لەگەڵ مبصر ناسیاویت هەیە؟ وتم: بەڵێ لەمێژە، لەو کاتەی خوێندکاری زانستگەی ئەفسەری بووم و بەمەسلەحەت ببومە ئەندامی حیزبی تودە و لەرێگای رۆیشتن بۆ ئازربایجان و چونە لای حکومەتی پوشالی و بێدەسەڵاتی ئازربایجان کە بەهۆی ئەو بەند کرام ناسیاویم هەیە. شا گوتی باشترە بچۆ لەگەڵ سپەهبود مبصر قسە بکەو بە موافەقەتی ئەو بچۆ لەوێ کار بکە.

من ئامانجم هەبوو هەروەك شا گوتبووی ئیدارەی ئیتلاعاتی شارەوانیم کردە یەك ساواکی چکۆلەو پڕکار. (دیارە مەبەست ساواکی کاتی نەسیری نیە بەڵکو کاتیپاکرەوان مەبەستە) بۆ دابین کردنی ویستی شا تا ئەو شوێنەی لەتوانام دا بوو درێغیم نەدەکرد.

# کاری سپەهبود تەیموری بەختیار پەرەی گرت

بەختیار شێرە پیاوێك بوو ئازاو دلێر، ئەم سەرداره لۆرزمانە نمونەی ئاوێنەیەکی گەورە بوو بۆ بەرەی داهاتوو کە چۆن خۆیان ئاگادارو تەیار بکەن بۆ خزمەتکردن بە ئێران. سپەهبود بەختیار لە ١٥ی خوردادی ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی (٦٣/٦/٤م) کاری چوبووە سەرو دەستی چاك دەڕۆیشت. کاتێ: صدام حسین وەك یارمەتی دەری سەرکۆمار بۆ جاری دووەم بانگی کردە عێراق، زۆر زوو دەستی کرد بە دامەزراندنی ناوەندی فێرکردن و بارهێنانی تەشکیلاتی پارتیزانی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی ئێران و کەسایەتیە بەناوبانگەکانی نارازی لەهەرێمی جیاجیای ئێراندا. هەروەها لەگەڵ ئەفسەران و دەرەجەدارانی هەڵاتوو پێوەندی گرت و هەندێ لە ئەندامانی حیزبی تودەی ئێرانیش کە لەوڵاتانی ئەوروپاو سۆڤیەت بوون بەوەوە لکان. منیش تا ئەو شوێنەی ئاگام لە کارو ئاکاری ئەو بوو، هەواڵم بە دەوڵەتی ئێران دەدا. ئەمریکاییەکانیش بەهۆی یانەی جاسوسی خۆیان، ساواکی ئێرانیان لە کاروباری بەختیار ئاگادار دەکرد. ئەگەر یانەی جاسوسی ئەمەریکا و ساواك نەبوایە لەوانەبوو بەختیار بەدەستی کەسانی تر بکوژرێ. ئازایی‌و دلێری و دڵنیایی بێ‌جێ بە پیاوەکانی خۆی بووە تیاچوونی ئەو.

# صدام حسين كۆڵی نەدەدا

صدام داوای ئەروەند رووەی دەکردو بە هی عێراقی دەزانی، ئەهەر گەمی ئێرانی بۆ ئاڵای عێراقی لەوێوە تێپەرِیبا هێرشی دەکردە سەر.

شای ئێران دوای گەرانەوەی لە ئەمەریکا لە زانکۆی پدافەندی میللی ئامادە نەبوونی خۆی بەسەبەبەب و هۆکاری جیاواز بۆ دەستووردانی هێرش دژی عێراق راگەیاند. شا چارەی نەبوو دەبوایە بەهەر هۆیەکی گونجاو لەگەڵ عێراق پێك بێ و پێوەندی دوور وڵات سارێژ بێتەوە و ناکۆکی لەبەین بچێ. مەسەلەی خودموختاری لە کوردستانی عێراق کە قەرار وابوو لە ساڵی ۱۹۷۵ سەقامگیر بکرێ. نەیەڵێ بگاتە ئامانج و ئەنجام بدرێ. هاوکات لەگەڵ ئەم بیرو بۆچوونە کاروان هێشتا دەرێدا بوو. شای ئێران هەوڵی دەدا نەرێگای دیکەوە و بەکەرەسەی دیکە شۆرِیان بەهێز بکاو بۆ بەربەرەکانی دژی هێزەکانی ئەرتەشی عێراق پشتیوانیان لێ بکا، تەنانەت لەکاتێکا کە ئێران ئامادە نەبوو دووسەت دانە چەکی سوکی لەکارکەوتووی وەك تفەنگ و موسەلسەلی برنو بدا بە پێشمەرگەکان لەو سەردەمەدا، دەستوری دا خومپارە بازوکاو دۆشکەی دژی فرۆکەو...... بەیارمەتی دەرەجەدارەکانی ئێرانی بۆ وێرانکردنی بەنداو بەربەندی ئاوەکان و ... بدەن بە شۆرِشیەکانی کورد شا هەمیشە لە بارەی بەجێ گەیاندنی پەیمان و بەڵێنی و ئەنجامی برِیارەکانی شۆرای بەرزی شۆرِش و هەروەها لە بابەت بەرِێوەبەردنی خودموختاری کوردستان لە عێراقدا و پێشوازی کردنی خەڵکی کورد، پرسیاری دەکرد بە دانانی یەکێك لە کوردەکان بۆ ئوستانداری شاری سولەیمانی و هەڵبژاردن بۆ دیاریکردنی شارەدار لە زۆربەی شارەکانی کوردزمان، پینە و پەرۆ کردنی جادەکان و بیر و مێشکی شای ئێرانی بە خۆیەوە خەریك و تارادەیەکیش ئاڵۆزی کردبوو شای ئێرانیش بۆ ئەوەی تا رِادەیەك ملە بەملانێ لەگەڵ عێراقدا بکات دەستی کرد بە ئاوەدانکردنەوەی شتی دیکە لە ناوچە جیاوازەکانی کوردزمانی ئێران. بەڵام ئەم

هەنگاوانە لە بەرانبەر خودموختاریدا کە ویستی هەموو خەڵکی کورد زمان بوو لە هەموو ناوچەکان و لە هەموو وڵاتەکانی شوێنی نیشتەجێی ئەوان مەسەلەیەکی دیکە بوو چونکە خەڵکی کوردزمان بە گشتی لە دەسەڵات بەسەر وڵاتی خۆیان و هەروەها بەڕێوەبردنی ناوچە لە بواری ئیدارییەوە بەشدار نەدەکران. کەوا بوو هەر کارێکی دەکرا ڕەواڵەت و مەسلەحەتی بوو. بڕوایان بە بنچینەی ئەو نەبوو. ئەگەر لەم لایە ئەم کارانە لە ناوچەی کوردستان دەکرا لە لایەکی تر ساواك جار ناجار ژمارەیەکی خەڵکی ناوچە جیاوازەکانی ڕۆژئاوای بە بیانووی جیاواز دەگرت خەڵکی هەلاتوی لە مەلا مستەفا وەردەگرتەوە بە زیندانی یان ئیعدام مەحکومی دەکردن. ئەم سیاسەتانە لەگەڵ یەك ناتەبا بوون و ئاکامی نالەبار و پێچەوانەیان نەبوو.

## بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ - ی ئەلجەزایر

شای ئێران بە بێ هیچ و پێشەکی یەك یا وتووێژ لەگەڵ بەرپرسانی سیاسی ئاگاداری و نیزامی وڵات بە ئامادەکردنی نهێنی و لە دەرەوەی جەغزی ئاگاداری کاربەدەستانی نێوخۆیی. لە ڕێگای کاربەدەست و کەسایەتیەکی هەڵکەوتوی ئیتلاعاتی وڵاتێکی دۆست. لەگەڵ ژنراڵ بومەدین سەرکۆماری ئەلجەزایر کە لەگەڵ ئەو کەسایەتیە دۆستایەتی هەبوو. بۆ وەلانانی ناکۆکی نێوان دوو وڵاتی عێراق و ئێران وتووێژی پێویستیان پێك هێنا ئەنجامی ئەم وتووێژە و ناوبژیکەری بومەدین بە بۆنەی پێکهێنانی کۆبونەوەکانی ئۆپێك. بو بەهۆی سەفەری پاشای ئێران بۆ ئەلجەزایر لە ئاکامدا شا لە تەك صدام حسین کەوتە ئاخاوتن و بەیاننامەیەك لەو بابەتەوە بلاو کراوە و دەستەی نوێنەرانی بۆ وتووێژ دیاری کران و لە ژێر چاوەدێری ئاغای دکتۆر قاسمیدا کە ئەو دەم

سەرۆکی ئیدارەی یەکەمی وەزارەتی دەرەوە بوو. پەیمانی ١٩٧٥ کە بە قەراردادی ئەلجەزایر ناسرا. لە لایەن وەزیرانی دەرەوەی دوو دەوڵەتی ئێران و عێراقدا ئیمزا کرا. دووای ئیمزای قەراردادەکە شای ئێران بە ئەرتەشبود نەسیری دەستووری دا تا مەلا مستەفا بانگ بکەنە تاران. کاتێ هاتە تاران شا پێی ووت ئێمە ئیختلاف و مەشاکیلی خۆمان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق کۆتایی پێ هێناوە و ئەمانەوێ لەگەل عێراق کە جیرانەو زوربەی خەڵکەکەی شیعەیە و لانی کەم دوو ملیۆن حەشیمەتی ئەو کوردەو لە هاوڕەگەزو برایانی ئێمەن، ئەمانەوێ پێوەندییەکی دۆستانەمان هەبێ و قەرارداریکیش لە بارو بابەتەوە ئیمزا دەکرێ. لە تۆش داوا دەکەم بەهەمموو بەرپرسانی حیزبی و پێشمەرگە رابگەیەنێ کە لەم سەعاتەوە شەڕ لەگەڵ ئەرتەشی عێراق تەواو بووە و کەس حەقی نییە سەرئێشە بۆ دەوڵەتی عیراق ساز بکات. ئێمە لەمەودوا بەهیچ چەشنێك یارمەتی بەدرێژەپێدانی شۆڕشی کورد ناکەین. ئەوەی پێوەندی بەئێران و دەوڵەتی شاهەنشاییەوە هەیە ملەبەملانێی لەگەڵ دەکەین. ئێوەش لەگەڵ ماڵباتی خۆتان و هەریەك لەسەرکردەکانی حیزبی و یا پێشمەرگە و ماڵباتیان ئەگەر بتانەوێ یان بیانەوێ دەتوانن پەنابەری ئێران بن و ژیان و ئاسایش و ئەمنیەتی گیانی هەمووتان دابین دەکرێ، و لە هەر شوێنێك دەوڵەتی شاهەنشاهی بیەوێ جێگاو رێگاتان پێ دەدا. مەلا مستەفا وەك هەمیشە پێی سەیرنەبوو، دەیزانی چی روودەدا چۆن دەبێ، بێ دەربڕینی بیروڕا ئیجازەی ویست کە بگەڕێتەوە بۆ ناوچە، مەلا مستەفا گەڕایەوە بۆ ناوچەی شیمال دەستووری دا هەموو سەرۆك و بەرپرسانی حیزبی و فەرماندەکانی لەشکرو یەکانی ناوچە جیاوازەکان لەشوێنی دانیشتی ئەو کۆبنەوە قسەکانی شای ئێرانی گێڕایەوەو گوتی "من بۆ درێژەپێدانی شەڕ ئامادەییم نیەو دەچمە ئێران هەریەك لەبەرپرسانی حیزبی و یا پێشمەرگەکان کە دەیانەوێ بچنە ئێران ناوو ئەژماریان بدەن بە من تا چۆنیەتی مانەوەو دانیشتنیان بدرێ بە بەرپرسانی

ئێرانی. هەر کەسێکی ناچێتە ئێرانیش خۆی دەزانێ دەچێتەوە ماڵی خۆی یا هەر بڕیارێکی تر دەدا. دیاریکردنی شوێنی مانەوەیان و ژیانیان لە ئێران بە دەست کاربەدەستانی ئێرانییەو پێش ئەوەی بچنە ئێران دەبێ چەك دابنێن یا لەگەڵ چوونی ئێران، بیاندەن بەبەرپرسانی سنووری ئێران، هەندێ لەسەرکردەکان و پێشمەرگەکان بەدژی ئاگر بەس وەستان و رایانگەیاند کە ئێمە سێزدە ساڵە بۆ بەدەست هێنانی مافی رەوای خۆمان لەم شاخ و داخە خەریکی شەڕو بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمنین، ئێمە بەچنگ و ددان بێ یارمەتی شای ئێران تا دواهەناسەی ژیانمان بەشەڕ درێژە پێدەدەین. مەلا مستەفا گوتی: ئەمە تەنیا لێبڕانی شای ئێران نییە، دەوڵەتە گەورەو زلهێزەکانی تر بیروڕایان وایە کە یارمەتی کورد نەدەن. ئێستا وام پێباشە شەڕ راگرین تا دەرفەت و هەلی ترمان بۆ دەڕەخسێ. ماوەیەك پشوو بدەین و هێزمان تازە کەینەوە تا بزانین چۆن دەبێ. جەلال تاڵەبانی و برایم ئەحمەد رایانگەیاند نیازێك نییە دانیشین تا بزانین چ دەبێ، ئەمڕۆکە ئەو هەموو پێشمەرگە چەکدارەمان هەیە، نەتوانین شەڕ بکەین سۆزی کە خۆ بدەین بەدەست دەوڵەتی ئێران و عێراقەوە چەك بکرێن، بەچ هیواو هۆیەکەوە بتوانین دووبارە هەستینەوە ئێمە دژی شەڕوەستان و چوونی ئێرانین، ئێمە بەشەڕدێین تا دەکوژرێین یا بە مافی خۆمان دەگەین. مەلا مستەفا لەگەڵ ئیدریس و مەسعودی کوڕیدا هاتنە ئێران و لە عەزیمییەی کەرەج لە خانوبەرەیەکی گەورە کە خاوەنەکەی رەزاز ئێرەوانی شیرازیبوو. نیشتەجێبوون.

برایم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانی و رابەرانی دیکەی کوردستان کاتێ دیتیان یارمەتییەك بەوان ناگاو مەلاو داروودەستەکەی لەوان جیابونەوەو دەوڵەتی ئێرانیش ئیجازەی داوە بە سوپای عێراق تا لەمەڵبەندی میهرانەوە بێنە ئێران و بچنە لای خانێ (پیرانشار) و لە پشت سەر پێشمەرگە دابەزین و ئەوانیان

دەورەو ئابلۆقە دا. بەناچار ئەوانیش لە ئێران داوایان کرد تا بێنە ئێران، یا لەوێ بمێننەوە یا ئیزنیان بدا بچنە هەندەران. ئێرانیش ئیجازەی دا لەو سەرو بەندە دابوو کە جلال تاڵەبانی کچی برایم احمدی خواست و ئێستا دوو کوری لەو هەیە کە لە ئینگلیز دەرس دەخوێنن. جەلال تاڵەبانی خۆی لە زانکۆی بەغدا لیسانسی حقوقی وەرگرتووە. ئەو چ لە کاتی دەرس خوێندن یا دووای ئەوە هەمیشە خەریکی حیزب و لە شەڕدا بووە. جا دووای هەوە لە ئێران ڕۆیی ماوەیەك لە سوریە مایەوە سەرئەنجام برایم احمد و ئەو چوونە ئینگلیز و لەوێ بوونە پەنابەر. جەلال تاڵەبانی بەر لە شۆڕشی ئێران چووە قاهیرە و دوکتۆرای حقوقی لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرت. برایم احمد و جەلال تاڵەبانی ئەمنیەتیان وەرگرت و چوونەوە بەغدا و لەگەل صدام وتووێژیان کرد و بە نابراویان گوت ئەوان بۆ کاروپلە و پایەی وەزارەت خەباتیان نەکردووە ئەوان پێشمەرگەی کوردن کە بۆ مافی خۆیان و میللەتی کورد شەڕیان کردووە. پاش چەند رۆژ مانەوە لە عێراق چوونەوە ئینگلستان. برایم احمد خوێندەواری حقوقی هەیە و پارێزەر و شاعیر و نوسەریشە. جەلال تاڵەبانی دووای جیابونەوەی لە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ڕێکخراوێکی بە ناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێك هێنا. لە دەست درێژی عێراق بۆ سەر ئێران و لە ماوەی شەڕی داسەپاوی هەشت ساڵەی دا شان بە شانی هێزەکانی چەکدار و ڕێکخراوەکانی ئێران لە تەك سپای عێراقدا بەشەر هات و لە نیشتمانی خۆی ئێران پارێزگاری کرد.

بەشەکەی دیکەی پارتی دیموکرات هەر بەو ناوە مایەوە و لە سەرەتاوە ئیدریس بەرپرس بوو کە کوری دووەمی مەلا مستەفایە دووای مردنی ئەو کە بە راوەستانی دڵ مرد مەسعودی برای بووە بەرپرسی پارتی دیموکرات. ئەم حیزبەش دووای هێرشی عێراق بۆ سەر ئێران کەوتە پارمەتیدانی جانبازانی

ئێرانی بە دژی سپای عێراق سەرکەوتنی هەردوو بەشی حیزب لە هەرێمی جیاجیای باکوری عێراق زۆر بەرچاو و جێگای شاناز بوو.
دوای نیشتنەجێ بوونی مەلا مستەفا لە ساڵی ١٩٧٥ لە ئێران بەرپرسان و لایەنگرانی ئەو هاتنە ئێران. دوای بەخشینی گشتی کە بەهۆی دەوڵەتی عێراقەوە راگەیەندرا هەندێ لە پێشمەرگەکان چونەوە سەر خان و لانی خۆیان. ئەوانەش وا بڕوایان بە بەعسی نەبوو. هاتنە ئێران ولە هەرێمی جیاجیای کرماشان نیشتەجێ کران.
بەم جۆرە ئاگرێ کە سێزدە ساڵ بڵێسەی دەکرد کوژایەوە بۆنی خوێن و کەلاك و باروت و دوکەڵ کە لە سوتاندنی ماڵ و حاڵیان پێشمەرگە و کوردی بێ تاوان لە ئاسۆوە بەرز بۆوە. هیوا و ئارەزوی کوردی نیشتەجێی ئەو مەڵبەندەی جیاکراوە لە ئێران لە نێو چرە دووکەڵدا دەچوە ئاسمان، بەڵام :
هەزاران ئەفسەر دەرەجەدار و سەربازی عێراق. بە سەدان کەس لە پێشمەرگەی عێراقی بە دەیان کەس لە ئێرانیەکان کوژران هەزاران خانوبەرە وێران و بە سەدان ئاوەدانی لە هەرێمی باکوری عێراق لەگەڵ خاك تەخت کران بە ملیارد پارە بۆ یارمەتی و پشتیوانی لە شۆڕشی پێشمەرگەکانی کوردزمان و بە نەتیجەی سەرنج راکێشی پێشبینی نەکرا و خەرج کرا. بە ملیۆن فیشەك. گوللە. تۆپ. خۆمپارە. بازوکاو بۆمب تەقێنراو تیا چوو. دەیان کەس بەرپرسی کاروباری جەبهەیی و پشتیوانی هێزەکانی شەڕکەر و شەڕی پارتیزانی لە خاکی کوردستانی عێراقدا بوون.
تەنیا بە ئەندازەی قامکی یەك دەست گەلاڵە دارێژ رابەری عەمەلیات و فەرماندەکان و سەرانی بەرپرس بۆ دابینکردنی سوود و بەرژەوەندی دەوڵەتی ئێران لە تەقەلا و تێکۆشاندا بوون. تەنیا دوو وڵات لەدنیادا لە رازی نهێنی ئەم گەلاڵە گەورەی سێزدەساڵە ئاگاداربوون ودەستێوەردانی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی ئەوان بوو کە بەڕاستی نرخی راستەقینەی دەوڵەتی ئێرانی

دابەزاند کە سازدەرو بەڕێوەبەری گەلاڵەکە بوو لە راست شەڕکەرەکانەوە. بەلام شای ئێران لە دەرەتانێکی شیاودا توانی رێبەرانی عێراقی مەجبور بکا کە مل بۆ ویستەکانی دەوڵەت و ئارەزوی میللەتی ئێران دانەوێنن ئاخرەکەی قەراردادی ئەلجەزایر کە بەپەیمانی ئەلجەزایر بەناوبانگەو نەتیجەو دەستکەوتێکی زۆر بەرچاوی بۆ دەوڵەتی ئێران بەدەست هێنا. ئەم رووداوە نەك هەر بۆ شانازی بوو بۆ دەورانی سەڵتەنەت و دەسەلات و دەسەلاتداریی ئەو لەمێژوودا تۆمار دەکرێ، بەڵکو هەموو بەرپرس و هەڵسوڕێنەرانی ئەم گەلاڵە مەزنە کە لەڕاستیدا هەر لە سەرەتاوە ناوێکی پڕ بەپێستیان لەسەر دانا، واتە ( گەلاڵەی پیرۆز) زیاتر سەربەرز لە ویژدانی خۆیدا هەست بەفێزو سەربەرزی و خزمەتگوزاری بەڕاستی بۆ ملك و میللەتی گەورەی خۆیان دەکەن.

## پێداچوونەوەی دەنگدانەوەی پەیمانی
### ١٩٧٥ – لە نێو کوردەکاندا

ووتوێژ و چاوپێکەوتن و رێککەوتن و ئاخرەکەی پەیمان بەستن. شێوەی بانگ کردن و راگەیاندنی هەڵوێست بە مەلا مستەفا و بڕیاری خێرای شەڕ راگرتن و چەك دانان، هێنانی لەشکری ئێران بۆ پشت سەری پێشمەرگەکانی کوردی عێراقی کە ماوەی ١٢ ساڵ لەو پەڕی ئازایەتیدا لەبەرانبەری لەشکری عێراق شەڕیان کردبوو. شێوەی وەدەرکەوتنی سووکایەتی بەرپرسان و پێشمەرگە لە ناوچە و هاتنیان بۆ ئێران و زۆر شتی تر، بوو بە هۆی ئەوە کە بلاوکراوەی نهێنی کوردەکانی ناوچە جیاکراوەکانی لە ئێران و پاشان بە ئاشکرا دژی دەوڵەتی ئێران و بە تایبەت شای ئێران تەبلیغاتی خراپ بکەن. چەپەکانی ئێران و ولاتانی تر لە باروداخ کەڵکیان وەرگرت لەگەڵ رێکخراوە کوردیەکان

گەلاڵەی هاوکاریان داڕشت. ئەو کوردانەی لە سەرانسەری جیهان لە کاتی شەڕی ١٣ ساڵەدا کە لەبارەی سیاسەت و شای ئێران پرسیاریان لێ کرابا. جگە لە ئافەرین و پێهەڵگوتن و خۆ بە ئێرانی دانان، شتێکی دیکەیان بە سەر زماندا نەدەهات، لە هەموو دەرفەت و هەڵکوتنێکدا، باسی بێ وەفایی کاربەدەستانی ئێرانی و پشت بەردانی ئەوانیان دەکردو بڕیاری تۆڵە سەندنەوەیان دەدا. ئەم مەسەلەیە بوو بەهۆی ئەوە کە دەنگدانەوەی پەیمان لە نێوان کوردەکانی نیشتەجێی سەرزەمینەکانی جیابۆوەی لە ئێران و هەروەها سیاسی و خوێندەوارانی لە وڵاتانی جۆر بە جۆری ئوروپا لێکۆڵینەوە بکرێ و نەتیجەشی لە پاشا ڕابگەیەنرێ.

ڕۆژێك بە هۆی پاکرەوان چوومە لای شا، لە قەراردادی ئەلجەزائیر زۆر شاد و بە کەیف بوو، بەڵام لە دژایەتی کردنی کوردەکان بە دژی شا لە هەندەران زۆر دڵگران بوو. دەستوری پێدام بڕۆم بە نهێنی لە هەندەران چاوم بە سەرکردەکانی حیزب و ئەو کوردانەی کە هاوکاریان لەگەڵ ئێمە دەکرد، بکەوێ کە بۆ چ ئێستا وا دژی ئێمە وەستاون. لەو کاروبارە بکۆڵمەوە و ڕێگا چارەیەك بدۆزمەوە. منیش وتم چۆن شا دەستور بدەن ئاوا دەکەم. لە پاشان هۆی سەفەرم سازدا و لە سەرەتاوە چوومە لەندەن و پاریس و ئاڵمان کە ناوەندی تێکۆشانی مەکۆی سیاسی کوردەکان بوو. لە گەڕانەوەمدا سەرم لە سوریە، تورکیە، لوبنان و عێراق داو دوای مانگێك هاتمەوە تاران. ڕاپۆرتێکم ئامادە کرد تەنانەت ئەو جوێنانەی وا بە دەرور و دیواری مێترۆکانەوە بە دژی شا لەو وڵاتانە نوسرابوو، تەنانەت ئەو مەقالانەی وا بەتەشەر لە ڕۆژنامەکانی هەندەران نوسرابوو، بە ورد و درشتەوە نوسی و نامە دەفتەری تایبەت.

ڕۆژێك بەهۆی سپەهبود بەدرەیی کە خەڵکی شارێك و دۆستم و فەرماندەی گاردی شاهەنشایی بوو، چوومە لای شا وتی: هەواڵەکانی تۆم خوێندەوە ، پێم خۆشە خۆت بۆم بگێڕیتەوە، منیش دەستم پێ کرد و بۆم گێڕایەوە وتم:

کوردەکان لەو کارەی وا لەگەڵیان کراوە نارازین ، شا بە توڕەییەوە بە دەنگی بەرز وتی: دەیانەویست لەبەر ئەوان سوود و بەرژەوەندی وڵاتم بنێمە ژێر پێ، ئەمە چ فکرێکی ئەحمەقانەیە ، وتم: ئەوان چاوەڕوانیکی وایان نەبووە و نییە ، چۆن هەر کورد زمانێ لەهەر قوژبنێکی جیهان دەژی و خۆی بە ئاری و لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ئێران بە پێوەندیدار ئەزانێ. ئەوەی کە دوای سێزدە ساڵ شەڕ و ماڵوێرانی و دەربەدەری و شەهید بوونی هەزاران پێشمەرگەی کورد، بە سوکایەتی پێکردن دەربکرێن و سپای عێراق لە ئێرانەوە بێن و پشتیان لێ بگرن وئابلۆقەیان بدەن. شا بە سەرسوڕمانەوە وتی: کێ و چ ڕێکخراوێك کاری وای لەگەڵ کردوون، وتم : بەهۆی ساواکەوە ، وتی: بە پاکرەوان بڵێ لەگەڵ نەسیری قسە بکا تا نەسیری ئەمەم بۆ روون بکاتەوە. هەرچەند ئاوێکم بە ئاردا کرد و شام لەو حاڵەتە دەرهێنا بەڵام ئاگری کینە و رقی نەسیریم سەبارەت بە خۆم هەڵایساند. شا وتی : ئێستا دەبێ چ بکەین؟ وتم: ئەمر شا بیەوێ دەبێ لە دەرەوەی هێزی ساواك ، تەنانەت بە بێ ئاگاداری ساواك ئەو کارانە ئەنجام بدرێ. لە وەڵامدا شا وتی : گەڵاڵەیەك ئامادە بکە تا بزانم چی بکەین! منیش گەڵاڵەیەکم ئامادە کرد و دامە دەست پاکرەوان و ئەوانیش بردیان و بێ وەڵام مایەوە، هەر کاتێك لە بابەت گەڵاڵەکەوە پرسیارم دەکرد، وەڵامیان نەبوو، ئەم بێ وەڵامییە بەردەوام ما تا بۆ دەرس خوێندن چوومە ئەمریکا و دوویەش شا مرد.

# ئاڵ و گۆڕ لە بابەت من و ساواك

دوای ئیمزا کردنی قەرردادی ئەلجەزایر کار گەیشتە ئێرە کە ساواك دەست بداتە گۆڕینەوەی نگاداری و هاوکاری لگەڵ عێراقدا بۆ ببە ئاکام گەیاندن و بەرێوەبردنی ئەو قەرارداده. چەند کۆڕ و کۆمەڵ بە نێو جیاجیا هاتوچۆی هەردوو ولآتیان دەکرد لە ببەت ملە بە ملانیێ کردنی لەگەڵ کۆمۆنیزم و چاوەدێری کردن لە بزوتنەوەی کورد و ... هتد، چەند گەلآڵەیان دارشت و برنیان بەرێوە. هەرچەند بەنامەی هونەری و غەیرە بۆ راگرتنی کوردەکانی ئێران بەرێوە دەبرا یا کاری باش لە بابەت دامەزراندنی کوردە پێشمەرگە پەناهێنەرەکاندا ئەنجام دەدرا، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردەکان ئازار درا بوون ئەو کارانە ئەوەندە جێگای نەدەگرت.

لەو سەدەمەی وا شا لەکاتی سەرکۆماری کارتێی – ی بادام فرۆش چووە واشنتۆن لە لیەن ساواکەوە دەستوور درا بوو کە لە سەرتا سەری ئەمریکا هەر ئێرانیەك بیەوێ بۆ پێشوازی کردن لە شای ئێران بچێتە واشنتۆن دی.سی خەرج و مەخاریجی سەفەر و سێ رۆژ مانەوەیان پێ دەدرێ. من لەگەڵ ئەوە دژ بووم و رامگەیند لوانەیە تودەییەکان. حیزبی و خوێندکارانی ئەندامی کۆنفیدراسیۆنەکانێ دژی شا و رژێم بە پارە و دراوی ئێران بچنە واشنتۆن و بە دژی شا خۆ نیشان بدەن. ئاغای سەفی نیا سەرکۆنسولی ئەودەم لە سانفرانسیسکۆ و خوێنەوار ، وتی : ئەمە ساواك بە قسەی شا ئامادەی کردووە، قسەی لێ نەکەیەن باشە دیار بوو نەسیری لە رێگای خۆیدا ساواك، کە بۆ بەرژەوەندی و سوودی نەتەوەی گەورەی ئێران پێك هاتبوو، لای دابوو. ئەوە بوو بوە ئاژاوە و تیاچونی رژێم. کە سەرئەنجام هەموو ئەو تاقمانەی دژ بە شا و رژێم بوون یەکیان گرت و لەبەر چەتری ئایەتوڵلای روحوڵلا خومەینیدا لە پریس راپەرین و بەخت و تەختی شا و ساواکیان مفرو تونا کرد ، من کە لە